ناوی کتێب: دکتۆر گلاس – ڕۆمان
نووسینی: یالمار سۆدێرباری
وەرگێڕانی لە سویدییەوە: دلاوەر قەرەداغی
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٩١٢
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی یەکەم: ٢٠٠٩
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢٥٠٤ی ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ

## چەند وشـەیەک
## لـەبارەی دوکتۆر گلاس و نووسـەرەکەیەوە...

یالمار سـۆدێرباری ١٨٦٩-١٩٤١ لە سـتـۆکـهۆڵم لـەدایک بووە و لە کۆپنـهاگن کۆچی دوایی کردووە. مـاوەیەک لە بەڕێوەبەرایەتیی گـومرگ و مـاوەیەکیش وەک ڕۆژنامەنووس و نزیکەی ١٠ساڵێکیش وەک نووسەری وتاری ڕەخنەگرانە و پێکەنینهێن لە ڕۆژنامەی سڤێنسکا داگبلادێت کاری کردووە و دواتریش لە ڕۆژنامەی بازرگانی و هامشۆی زەریاییی گۆتنبۆرگدا سەختترین و چڕترین بەرخـــۆدانی دژی نازیزم و لایەنگرانی نازییـــەت بە نووســـینی وتاری ڕەخنەگرانە، ڕاگەیاندووە.

سـۆدێرباری سـاڵی ١٨٩٥ بە ڕۆمـانی (لادانەکـان) هاتە نێـو دونیـای ئەدەبییـاتی سوێدییـەوە. ئەم کـتـێـبە قـسـە و باسـێکی گـەورەی لـە ناوەندە جیاجیاکاندا وروژاند و وەک کـارێکی نامـۆڕاڵیی ئامـاژەی پێدرا و مـۆرکی "ئیغواکەری گەنجان" بە نووسەرەکەیەوە نرا. کتێبی (جاحێڵیی مارتین بیرک) کـە لە سـاڵی ١٩٠١دا بـڵاوبووەوە، بریتـییـە لە ڕۆمـانێکی نیـمچـە یادەوەری و سەرکەوتنێکی بەرچاوی بۆ سۆدێرباری چنییەوە. بیرک پاڵەوانی ڕۆمانەکە، کە لە ڕاستیدا هەمان منداڵی و جحێڵیی سۆدێرباری خۆیەتی، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوەوە، ناتوانێ وەک نووسـەرێک دەربکەوێ و ناچار لە نووسـینگەیەکدا شـان دەداتە بەر کـاری خـەڕەکـئـاسـای نووسـینگە. هەمـان کـارەکـتـەر دواتر لە کـتـێبەکـانی تری سـۆدێرباریدا دەردەکەوێتەوە کـە وازی لە کـاری نووسـینگە هێناوە. ئەمـەش یەکـێکە لە خـەسلـەتەکـانی ئەدەبیـیـاتی سـۆدێرباری کـە کارەکتەرێک لە کتێبێکیدا، هەمدیس لە کتێبەکانی تریشیدا دەردەکەوێتەوە.

کتێبی دوکتۆر گلاس لە سـاڵی ١٩٠٥دا دەرچووە و ڕەخنەگران بە لوتکە و یەکـێک لە هەرە جـوانترین کـارەکانی سـۆدێرباری دەزانن، نـەک هـەرئەوەندە، بگرە بەهـۆی کـامڵـی و جـوانیی زمـانەکـەیەوە بە یەکێک لـەو کارە جـوانانە لە

قەڵەم دەدرێت کە لە ئەدەبییاتی سوێدیدا نووسراوە.

ئەم ڕۆمانە یاداشتی ڕۆژانەی سێ مانگی کەسێتییەکی دوکتۆرە بەناوی تیکۆ گابریل گلاس و کتێبەکە نزیکەی سەد ساڵە نووسراوە و بڵاوبووەتەوە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا هەمان ئەو پرسە مۆراڵییەی ئەمڕۆ سەبارەت بە ڕەوایی کوشتنی کەسێک لە پێناو ڕزگارکردنی کەسێکی تردا، دەوروژێنێ.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەوە بکرێت کە لەو ساڵانەی پێشوودا ئەم ڕۆمانە چووبووە ناو پرۆژەیەکەوە بەناوی "ستۆکهۆڵم کتێبێک دەخوێنێتەوە"، کورتەی پرۆژەکە بریتییە لە ڕۆنانی نەریتێک بەوەی هەموو خەڵکی ستۆکهۆڵم لە ماوەی ساڵێکدا هەمان کتێب دەخوێننەوە و دواتر لەماوەی ئەو ساڵەدا ناوەڕۆکی کتێبەکە دەبێتە بابەتی وتووێژی خەڵک لەناو ترام و ماڵ و ڕیستۆرانت و پشووی کار و ڕیزی چاوەڕێکردنەکاندا.

وەک ئاماژەمان پێ دا، دوکتۆر گلاس یەکێکە لەو کارانەی کە لە ئەدەبییاتی مۆدێرنی سوێدیدا قسەوباسێکی زۆری وروژاندووە، بووەتە پێگە و فیگورێکی سێنترالی لە ژیانی کولتووریی ئەو وڵاتەدا، وێڕای نووسینی دەیان بابەت و خوێندنەوەی جیاواز لەسەری، هاوکات بووە تە ئیلهامبخەشی نووسینی چەند ڕۆمانێکیش کە سەرنجڕاکێشترینیان ڕۆمانی (گریگۆریۆس)ەکەی بێنگت ئوهلسۆنە. لەو ڕۆمانانەش کە بەمدواییانە بە ئیلهام وەرگرتن لە دوکتۆر گلاس نووسراون و لەگەڵیدا کەوتوونەتە قسەوە، ڕۆمانێکی خاتوون شێشتین ئێکمانە بە ناوی (پراکتیکی کوشتنەکە) و ڕۆمانێکی خاتوون (ئیرگیتا لیندێن)ی تەمەن هەشتا و حەوت ساڵەیە بەناوی (من هێلگا گریگۆریۆس)م. ئەم ڕۆمانە یەکەمین کتێبی ئەو خاتوونەیە و بڕیارە لە زستانی داهاتوودا چاپ بکرێ. هەروەها ئەم ڕۆمانە کراوەتە شانۆنامەیەکی مۆنۆدراما و دەرهێنەر و ئەکتەری بەناوبانگی سوێدی (توشتێن فلینک) چەند جارێک لەسەر شانۆ نواندوویەتی. ئەم هونەرمەندە لەبارەی کەسێتیی دوکتۆر گلاسەوە دەڵێ: "ناتوانم بڵێم خۆشم دەوێت. ئەو بکوژە و ئەمەش شتێکە کە من پشتگیریی ناکەم. بەڵام ئەو دیوە تاریکانەی کە

لەودا هەیە، لە هەمووماندا هەیە. ئەو خەمە ئینسانییەی لەودا هەیە، بێ ئەندازە بەسۆ و جوانە".

سۆدێرباری لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا و لەو کاتەی کە ئیدی لە کۆپنهاگن نیشتەجێ دەبێ، کەمتر کار لە ئەدەبییاتدا دەکا و زیاتر خۆی بە توێژینەوە تیۆلۆگییەکانییە وە سەرقاڵ دەکات، دوایین توێژینەوەی لەو ڕووەوە بابەتێکە لەبارەی کەسێتیی مەسیح و باراباس(*) و تێ هەڵکێشبوونی ئەو دوو کەسێتییە لە کەسێتی مەسیح خۆیدا.

وەک وەرگێڕیش سۆدێرباری، جێنس پێتەر یاکۆبسێن و ئەناتۆلێ فرانس و مۆپاسانی لە فەڕەنساییەوە بۆ سوێدیی وەرگێڕدراون.

کارەکانی سۆدێرباری لە میانەی ژیانیدا جێگەی بێنەوبەردەیەکی زۆر بوون، لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگاردا، لەلایەن رووبەرێکی بەرفراوانەوە لە ڕەخنەگر و خوێنەران پێشوازیی گەورە لە نووسینەکانی کراوە و ئەمڕۆ وەک یەکێک لە ڕووە زیندووەکانی ئەدەبییاتی کلاسیکی سوێدی، ئاماژەی بۆ دەکرێت.

هەندێک لە کارە ئەدەبییەکانی تری سۆدێرباری:

بێگانەکان ۱۹۰۳، گێرترود (دراما) ۱۹۰٦، ئەستێرەی ئێوارە ۱۹۱۲، گەمە جدییەکە ۱۹۱۲، نووسینەکان ۱۹۲۱، سەفەر بۆ رۆما ۱۹۳۱، دوایین کتێب ۱۹٤۲، کۆنووسین ۱۹٤۳، نۆڤێللەکان ۱۹٦۲، یالێی خۆشەویست... "بو"ی ئازیز ۱۹٦۹ (نامەکانی نێوان بو بێرگمان و یالمەر سۆدێرباری ۱۸۹۱–۱۹٤۱).

دواجار هیوادارم هەوڵی وەرگێڕانی ئەم کارە و خوێندنەوەی بە زمانی کوردی، جێگەیەکی گچکە لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ بکاتەوە و منیش توانیبێتم شتێکم لە جوانیی ئەم کتێبە بۆ خوێنەری کورد گواستبێتەوە.

دلاوەر قەرەداغی – یونی ۲۰۰۹

---

(*) Barabbas چەتەیەک کە پیلاتیوس لەسەر داوای خەڵک، لە بری مەسیح ئازادی کرد. نووسەری سوێدی "پار لاگێرکڤیست"یش رۆمانێکی بەهەمان ناوەوە هەیە. و. کوردی

## ١٢ی یونی

هەرگیز هاوینی وام نەبینیوە. گەرمای مانگی گەنین(*) هەر لە ناوەڕاستی مانگی "مای"یە وە. بەدرێژاییی ڕۆژ غوبارێک لە تۆزوخۆڵ، تەواوێک بێ جووڵە بەسەر جادە و گۆڕەپانەکانەوەیە.

تەنیا لە ئێواراندا بنیادەم تۆزقاڵێک دەژی. تازەکی لە پیاسە هاتوومەتەوە. تا ڕادەیەک هەموو ڕۆژێک دوای سەردانی نەخۆشەکانم پیاسە دەکەم. ئێستا لە هاویندا ئەو پیاسانەم کەم بوونەتەوە. لێکدا لێکدا بایەکی فێنک لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدەکات، غوبارەکە بەرزدەبێتەوە، بە شێنەیی دەجووڵێ و دوور لە خۆرئاوادا دەبێتە سەرپۆشێکی درێژ لە خۆڵێکی سوور. چیدی تەقەتەقی عارەبانەکانی ئیش نەماوە ، تەنیا ناوبەناو دەنگی گالیسکەیەک یان زرینگەی زەنگی ترامەکە دێت. بە ڕیتمێکی هێواش بە جادەکەدا شۆڕدەبمەوە، جاروبار

---

(*) rötmånad : مانگێکە دەکەوێتە نێوان ٢٣ی تەمووز و ٢٣ی ئابەوە و گەرمایەکی شێداری هەیە. و. کوردی

ڕێکەوتی ناسیاوێک دەکەم، ڕادەوەستم و لە سوچێکی جادەکەدا بۆ ساتێک لە تەکیدا دەکەومە دەمودو. بەڵام بۆچ دەبێ من هەمیشە تووشم ببێ بە تووشی قەشە گریگۆریۆسەوە؟ ناتوانم ئەو پیاوە ببینم و قسەیەکی خۆشم بیرنەکەوێتەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لەبارەی شۆپینهاوەرەوە بیستوومە. فەیلەسوفی مڕومۆچ ئێوارەیەکیان بە تاقی تەنیا وەک هەمیشە، لە سوچی قاوەخانەکەیدا دادەنیشێ، دەرگا دەکرێتەوە و کەسێک بە دەموچاوێکی ڕەزاتاڵەوە خۆی بە ژووردا دەکات. شۆپینهاوەر بە ڕوخسارێکەوە لێوانلێو لە قێز و نەفرەت تەماشای دەکات، بۆی هەڵدەسێ و بە گۆچانەکەی دەکێشێت بەسەری کابرادا. ئەوە تەنیا لەبەر دەموچاوی.

ئێ، من خۆ ئێستا هیچ شۆپینهاوەرێک نیم، کە لەسەر پردی ڤاسا لە دوورەوە قەشەم بینی بەرەوڕووم دەهات، خێرا ڕاوەستام و دەستم بە شیشبەندی پردەکەوە گرت و کەوتمە تەماشاکردنی دیمەنەکانی ئەو ناوە. خانووە ڕەساسییەکانی هێلگیاندسهۆلم، ئارشیکتوری تەختەییی پەڕپووت و گۆتیی(*) ساونا کۆنەکان کە سێبەرەکانیان تێکشکاو لە ئاوە بەخوڕەکەدا پێچەوانە دەبوونەوە، داربییە گەورە پیرەکان کە گەڵاکانیان لەنێو سێڵاوەکە هەڵکێشابوو. خواخوام بوو قەشە نەیبینیبێتم و لەدواوە نەیناسیبێتمەوە، من هەر لەو ماوە کورتەدا ئەوم لە بیری خۆمدا سڕیبووەوە کە کتوپڕ بینیم لە نزیکمەوە ڕاوەستاوە و وەک من باسکی ناوەتە سەر شیشبەندی پردەکە و ملی بە لارەوە ناوە، ڕێک هەمان ئاکار کە بیست ساڵ لەوەوبەر لە کڵێسای یاکوب، کاتێ لە ڕیزە کورسییەکانی خێزانیی لای دایکی خوالێخۆشبوومەوە دانیشتبووم و بۆ یەکەمجار ئەم باوکە ئازیزە، ئەم دەعبا ترسناکە وەک قارچکێکی قێزەون، خۆپێچاو لە جبەکەیەوە، لەسەر کورسیی وەعزدان هەڵتۆقی. هەمان ڕوخساری قەڵەو و خۆڵەمێشی، هەمان خەنافیزی پیس و

(*) göticism: ستایلێکە لە ئەدەب و نیگارکێشاندا، لە سەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا برەوی هەبووە و مەیلێکی بەهێزی تێدابووە بۆ گەڕانەوە بەرەو مێژووی دێرینی باکور. و. کوردی

زەرد کە دەشێ ئێستا کەمێک سپی بووبێ و هەمان نیگای سادەی ناڕۆشنی ئەودیو چاویلکەکەی. نەدەکرا خۆی لێ نەبان بکرێت. هەڵبەت ئێستا من وەک زۆر کەسی تر دوکتۆری ئەویشم و هەندێ جار بە دەرد و عیللەتەکانییەوە دێت بۆ لام.

– ئێوارەت باش جەنابی قەشە.. وەزعتان چۆنە؟

– باش نیم، بەڕاستی باش نیم، دڵم خراپ لێ دەدات ، نایەکسان دەزرمێنێ. شەوانە هەندێ جار پێم وایە لە لێدان دەکەوێ.

لە فیکرەوە دەچم: ئەوە شادمانم دەکات، هەی پیرەمێردی شووم، خۆزیا دەمردیت، ئەوسا لەکۆڵ ئەوە دەبمەوە کە چیتر بتبینم. بێ لەوەش ژنێکی جوان و گەنجت هەیە کە پێ دەچێ ژیانت لێ کردبێتە دۆزەخ و کاتێ دەمریت، شوو دەکاتەوە و مێردێکی زۆر باشتر بۆ خۆی پەیدادەکات.

بەڵام بە دەنگی بەرز پێم گوت: "بەڕاست، ئاوا، قەشە دەتوانێ لەم ڕۆژانەدا سەردانم بکا، تا بزانین مەسەلە چییە".

بەڵام ئەو شتی زۆر لەوە زیاتری هەبوو دەیویست باسیان بکات، گرنگترین شتەکان: ئەم گەرمایە تەواو ناسروشتییە، گێلێتییە ئاپارتمانێکی گەورەی پارلەمان لەم دوورگە گچکەیەدا رۆبنرێت، بێ لەوەش ژنەکەم تەواو سەرحاڵ نییە.

دواجار ئەو ڕۆیشت و منیش بە ڕێگای خۆمدا هاتم. خۆم کرد بە گەڕەکە دێرینەکەی شاردا، بە تەپۆڵکەکەی کڵێسای گەورەدا سەرکەوتم، چوومە کۆڵانە تەنگەبەرەکانییەوە. زەردەپەڕێکی تاساو لە درزی باریکی نێوان خانووەکاندا، سێبەری سەیر لەمسەر بۆ ئەوسەری دیوارەکان، سێبەرگەلێک کە بنیادەم هەرگیز لە کۆڵانەکانی ئێمەدا نایانبینێت.

خاتوو گریگۆریۆس، لەم رۆژانەدا سەردانێکی سەیری کردم. بۆ کلینیکەکەم هات، زۆر باش ئاگاداری هاتنی بووم و لەکاتێکی باشیشدا هات، بەڵام تا دوایین کەس چاوەڕێی کرد و لێ گەڕا نەخۆشەکانی تر کە دواتر هاتبوون،

پێشی بکەون. پاشان هاتە ژوورەوە. سوورهەڵگەڕاو و لاڵەپەتە دەدوا. دواجار شتێکی بۆ هات گوایە قورگی ئازاری هەیە. ئا، ئێستا باشترە. گوتی: "سبەینێ هەمدیس دێمەوە، ئێستا زۆر پەلەمە...".

هێشتا نەهاتووەتەوە.

لە کۆڵانە باریکەکان هاتمە دەرێ، بەرەو خوار بەرەو پردی شێپ. مانگ بەسەر "شێپهۆلم"ەوە لەو شینایییەدا زەردێکی لیمۆیی دەینۆڕی. بەڵام من هەموو خولقی سوکەڵەیی و ئارامییەکەم ڕەویبووەوە، تووشەوەبوونم بە گریگۆریۆسەوە خولقی تێک دابووم. نەفرەت کە خەڵکانێکی ئاوها وەک ئەو لەم دنیایەدا هەن! کێ ئەو سەرگوزەشتە دێرینەی لەیاد نییە کە زۆرجار دەبێتە بابەتی وتووێژ، کاتێک چەند داماوێک پێکەوە لەسەر مێزێکی قاوە خواردنەوە دادەنیشن و لەبارەی ئەوەوە کە: گەر تۆ بتوانیت تەنیا بە دەستنان بە دوگمەیەکی دیوارەکەدا، یان بەهۆی حەزێکی ڕووتەوە چینییەکی پلەوپایەدار بکوژیت و پاشان سەروەت و سامانەکەیت بۆ بمێنێتەوە، ئاخۆ بەو کارە هەڵدەستیت؟ هەرگیز توانام نەبووە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، ڕەنگە لەبەرئەوە بێت کە من هەرگیز تەواوێک توند و دژوار تامی بەدبەختیی هەژاریم نەچەشتووە. بەڵام پێم وایە گەر بمتوانیبایە لە ڕێی دەستنان بە دوگمەیەکی دیوارەکەدا ئەو قەشەیەم کوشتبا، ئەوا چ سێ و دووم لێ نەدەکرد و دەمکوشت.

ئەوسا کە لەو زەردەپەڕی ئێوارە ناسروشتی و ڕەنگپەڕیوەدا بۆ ماڵەوە چوومەوە، پێ دەچوو گەرما وەک هەمان گەرمای نیوەڕۆ بۆژۆکەر بێت، وەک ئەوەی بە پەژارە چڕبووبێتەوە، هەورە خۆڵاوییە سوورەکان لەودیو دووکەڵکێشەکانی کارگەکەوە لە کونگسهۆلم، تاریک داهاتبوون و لە کارەساتی نوستوو دەچوون. بە شەقاوی گەورە بەلای کڵێسای کلارادا بەرەو ماڵ بوومەوە، کڵاوەکەم بە دەستەوە، چونکە ئارەقە بە نێوچەوانمدا تەزوولەی کردبوو. تەنانەت لە ژێر درەختە گەورەکەی گۆڕستانەکەشدا چ فێنکایییەک نەبوو، بەڵام تا ڕادەیەک لەسەر هەموو سەکۆکان، جووتێک دانیشتبوون و

چپەچپیان بوو، هەندێکیشیان لەسەر ئەژنۆی ئەویتریان دانیشتبوون و بە چاوانێکی خومارەوە یەکتریان ماچ دەکرد.

**

ئێستا لەبەر پەنجەرە کراوەکەمدا دانیشتووم و ئەمە دەنووسم. – بۆ کێ؟ بۆ هیچ هاوڕێیەک و بۆ هیچ کچە هاوڕێیەک، تەنانەت بەحاڵ بۆ خۆیشم، چونکە ئەوەی دوێنێ نووسیومە ئەمڕۆ نایخوێنمەوە و سبەینێش هەر نایخوێنمەوە. من دەنووسم تا دەست بجوڵێنم، بیر و غایلەم خۆی دەجووڵێت، دەنووسم تا زەمەنێکی بێ خەوی بکوژم. بۆچ خەوم لێ ناکەوێت؟ خۆ من لە هیچ تاوانێک نەگلاوم.

**

ئەوەی لەسەر ئەم کاخەزە دەینووسم، چ ددانپیانانێک نییە. دەبێ ئیعتیراف بۆ کێ بکەم؟ من هەموو شتێک لەبارەی خۆمەوە ناگێڕمەوە. تەنیا ئەوە دەگێڕمەوە کە هەوەسم لێیە بیگێڕمەوە، بەڵام هیچ شتێک لەبارەی ئەوەوە ناڵێم کە ڕاست نییە، درۆ لەبارەی بەدبەختیی ڕۆحمەوە، جا ئەگەر بەدبەخت بێت، ناکەم.

**

لە دەرەوە ئەو شەوە شینە گەورەیە بەسەر درەختەکانی گۆڕستانەکەدا دراوە. ئێستا شار بێدەنگە، هێند بێدەنگ کە هەناسە و چرپەی تارماییەکان لە خوارەوەڕا دەگاتە سەرەوە بۆ ئێرە و بۆ ساتێک پێکەنینێکی بێ شەرمانە ئەو بێدەنگییە دەشکێنێت. هەست دەکەم وەک بڵێی لەم ساتەوەختەدا کەس لەم دنیایەدا نییە لە من تەنیاتر بێت. من، دوکتۆر تیکۆ گابریل گلاس کە جاروبار یارمەتیی کەسانی تر دەدەم، بەڵام هەرگیز نەمتوانیوە یارمەتیی خۆم بدەم ، بەوەی کە سی و سێ ساڵم پڕکردووەتەوە، هەرگیز لە ژنێک نزیک نەبوومەتەوە.

**

## ١٤ی یونی

ئەمە چ ئیشێک بوو! چۆن بوو لەنێو هەموو ئەو ئیشانەدا ئەمەیانم هەڵبژارد کە کەمتر لەگەڵمدا دێتەوە؟ دوکتۆرێک دەبێ یەکێک بێ لەم دووە: یان دەبێ خەڵکویست بێت، یان ناوبانگویست. ئەوە ڕاستە، ئەو زەمانە من پێم وابوو هەردووکیانم.

ئەمڕۆیش هەمدیس ژنێکی گچکە لێرە بوو کە دەگریا و سواڵی دەکرد و دەپاڕایەوە یارمەتیی بدەم. من لە چەند ساڵێک لەمەوبەرەوە ئەو ژنە دەناسم. شووی بە فەرمانبەرێک کردووە کە موچەکەی چەند هەزار کرۆنێک یان شتێکی ئاوهایە لە ساڵێکدا و خاوەنی سێ منداڵ. لە یەکەمین سێ ساڵدا منداڵەکان بەدوای یەکدیدا لەدایک بوون. پاشان بۆ ماوەی پێنج یان شەش ساڵ لە ئاسوودەییدا بوو، هەمدیس نەختێک تەندروستی و گوڕ و جحێڵیی بۆ گەڕایەوە، ماڵەکە کەمێک کەوتەوە سەرخۆی و دوای کارەساتەکان کەمێک هەستایەوە سەر پێ، هەڵبەت لە نان کەم بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژیان هەر بەڕێوەدەچوو. کەچی وا هەمدیس کارەسات گەڕابووەوە.

لەبەر گریان بەحاڵ دەیتوانی قسان بکات.

هەڵبەت من هەمان ئەو وەڵامەم دایەوە کە لەبەرمە و هەمیشە لە هەڵوێستگەلی وەک ئەوەدا دەیخوێنمەوە: ئەرکی من وەک دوکتۆر ڕێزگرتنە لە ژیانی مرۆڤ، لە ساواترینیان.

من جیدی و پێچەقێن بووم. دواجار ناچار بوو خەجاڵەتبار و شپرزە و بێ دەسەڵاتانە بڕوات.

هەڵوێستەکەم یاداشت کرد، ئەوە هەژدەمین هەڵوێستێک بوو کە لە ئیشەکەمدا ڕووبەڕووی دەبوومەوە، گەرچی دوکتۆری ژنانیش نەبووم.

یەکەمیانم هەرگیز بیرناچێتەوە. کیژێکی گەنج بوو، بیست و دوو ساڵ یان شتێکی ئاوها بوو. بەخۆوەیەکی پرچ ڕەش، جوانییەکەی کەمێک گەنجانە و

ناشارستانییانه بوو. مرۆڤ یەکسەر ئەوەی تێدا دەبینی کە لەو جۆرەیە دەبێت لە سەردەمی لۆتەر(*)دا سەرزەوییان لێ پڕ بووبێت، هەڵبەتە گەر لەسەر حەق بووبێت کاتێک نووسی: مەحاڵە ژنێک بەبێ پیاو بژی، بەهەمان مەحاڵ بوونی ئەوەی کە مرۆڤ بتوانێ گاز لە کەپووی خۆی بگرێت. خوێنێکی چڕی بۆرژواییییانە، باوکی بازرگانێکی پارەدار بوو، بۆیە هات بۆ لام، چونکە دوکتۆری خێزانییان بووم. ئەو تووڕە و نائارام، بەڵام زۆر شەرمن نا.

پاڕایەوە: "ڕزگارم کە!" من بەهەمان مەسەلەی وەزیفە و چتی لەو جۆرە وەڵامم دایەوە، بەڵام دیاربوو ئەوە شتێک بوو کە تێی نەدەگەیشت. بۆم ڕاڤە کرد کە هەڵبەت یاسا لە دۆخی لەو جۆرەدا گاڵتە نییە. ڕوخساری پرسیاراوی دەینواند: یاسا؟ ئامۆژگاریم کرد کە دڵی خۆی بۆ دایکی بکاتەوە: ئەوسا ئەویش لەگەڵ باوکیدا قسان دەکات و ئیدی بەو شێوەیە زەماوەند دەسازێت.

– ئۆو نەء، دەسگیرانەکەم هیچی نییە و باوکم هەرگیز نامبەخشێت.

ئەوان دەسگیرانی یەکدی نەبوون. ئەو گوتی "دەسگیران" تەنیا لەبەر ئەوەی کە نەیتوانی چ وشەیەکی تر بدۆزێتەوە، "یار" وشەی ناو ڕۆمانەکانە و لە ئاخاوتنندا بێ ئابڕووانە خۆدەنوێنێت.

– ڕزگارم کە، چما ئاخۆ چ ڕوحمێکتان نییە! نازانم چ بکەم، دەچم بۆ نۆڕسترۆم و لەوێوە خۆم فڕێ دەدەمە ڕووبارەکەوە!

کەمێک پەتی بڕستم پسا. ئەو چ هاوسۆزییەکی تایبەتیشی تێدا نەوروژاندبووم، تەنێ گەر پارە هەبێت، ئەوا هەڵبەت هەمیشە ئەم جۆرە شتانە دەسازێن. تەنیا ئەوە شانازییە کە نەختێک زەبری بەردەکەوێت. کەوتە لووشکەلووشک و فنگ کردن و قسە بەیەکدادان، دواجار خۆی بە عەردێدا دا و کەوتە لنگەفرتێ و قاووقیژ.

دەی باشە، بێگومان کێشەکە بەو شێوەیە کۆتایی پێ هات کە من

(*) Martin Luther (١٤٨٣– ١٥٤٦)، دامەزرێنەری ریفۆرماسیۆنی ئاینزای ئینجیلی لۆتەری (دابڕانی پرۆتێستانیزم لە کڵێسای کاتۆلیک). و. کوردی

مەزەندەم کردبوو: باوک کە خوێڕییەکی دڵڕەق بوو، دوو شەپازڵلەی لە کچە سرەواند، بەوپەڕی خێرایی بە کوڕەی شەریکە تاوانی بە شوو دا و ئینجا بۆ سەفەری زەماوەندی هەناردن.

هەڵوێستگەلی وەک ئەوەی ئەو کچە هەرگیز نەیخستوومەتە مەراقەوە. بەڵام ئەوەی ئەم کچە گچکە ڕەنگپەڕیوەی ئەمڕۆ ئازاری داوم. ئاخر ئەو هەموو عەزاب و بەدبەختییە بۆ نەختێک لەزەتی ئاوهایی.

ڕێزگرتن لە ژیانی مرۆڤ... کە بووەتە وێردی سەر زارم، هیچ نییە جگە لە دووڕوویەکی بەد، هیچ نییە جگە لەوەی کە جار ناجار ساتێک دەسبەتاڵی بە بیرلێکردنەوەیەوە بەسەر دەبرێت. دنیا جەمەی دێت لە مرۆڤ. سەبارەت بە ژیانی ئینسانی نامۆ و نەناسراو و نەبینراو، هەرگیز کەسێک کەمترین بایەخی پێ نادات، دەشێ لەگەڵ ریزپەڕدا بۆ هەندێک کەسی مرۆڤدۆستی گاڵتەجاڕی زۆر زۆر بەرچاو. مرۆڤ ئەوە لە کرداردا پیشان دەدات. هەموو حکومەت و پارلەمانەکان لە دنیادا ئەوە پیشان دەدەن.

ئەدی ئەرک ، چ پۆشاکێکی نایابە خۆت پێوەی بخزێنیتە دواوە تا خۆت لە ئەنجامدانی شتێک، کە دەبێ ئەنجام بدرێت، بدزیتەوە.

بەڵام خۆ بنیادەم ناشتوانێ لەبەر خاتری خەڵکانێکی نەناس و بێ باک، قومار لەسەر پلەوپایە و ناوبانگ و داهاتووی خۆی بکات. کەواتە حیسابکردن بۆ بێدەنگیشیان شتێکە منداڵانە. کیژە دۆستێک بەهەمان گرفتارییەوە دێت، ئەوسا وشەیەک دەچرپێنرێت لەبارەی ئەوەوەی کە یارمەتی لە کوێ دەست دەکەوێت و ئیدی دەستوبرد بنیادەم دەناسرێت. نا، باشتر ئەوەیە کە مرۆڤ بە ئەرکەوە بنووسێت، گەرچی ئەویش وەک ئاواییەکانی پوتێمکین(*) کۆلیسێکی

---

(*) Potemkin: گریگۆری پۆتێمکین ١٧٣٩– ١٧٩١، میرێکی ڕووسی و عاشقی کاتارینا. کاریگەریی گرنگی خۆی بەسەر بەڕێوەبردنی وڵاتەوە دانا . بەزۆر نیوە دوورگەی (کریم)ی نێو زەریای ڕەشی بە ڕوسیاوە لکاند و سەرۆکایەتیی شەڕی دژی تورکیا کرد. زاراوەی کۆلیسەکانی پوتێمکین، مەبەست لەو نیگارانەیە بە =

بۆیاخکراو بێت. من تەنیا لەوە دەترسێم هێند فۆرمۆلێرای ئەرکەکەم بخوێنمەوە، کە ئیدی دواجار خۆم باوەڕی پێ بکەم. پوتێمکین تەنیا ژنە سیزارەکەی خۆی فریو دەدا، ئاخۆ دەبێ خۆفریودان چەندێک قێزەوەنتر بێت.

**

پلەوپایە. ناوبانگ، داهاتوو. وەک ئەوەی من هەموو ڕۆژ و هەموو لەحزەیەک ئامادە نەبووبم کە ئەم کۆڵە، سەرخەمە سەر ئەو کەشتییەی کە بە کردارێک بار دەکرێت.

کردارێکی واقیعییانە.

### ١٥ی یونی

هەمدیس لەبەر پەنجەرەکەدا دادەنیشم، شەوی شین لە دەرەوەڕا بێدار، دەنگی چپەچپ و خشەخش لە ژێر درەختەکانەوە دێ.

ئێوارە لە کاتی پیاسەی عەسرانمدا ژن و مێردێکم بینین. دەسبەجێ ژنەکەم ناسییەوە، ساڵانێکی زۆر نییە لە ئاهەنگی سەمادا، سەمام لە تەکیدا کردبوو، یادم نەچووەتەوە کە هەر کاتێ دەمبینی، شەوێکی بێ خەویی بە دیاری پێ دەبەخشیم. بەڵام ئەو هیچی لەبارەی ئەوەوە نەدەزانی. ئەوکات ئەو هێشتا شووی نەکردبوو. پاقیژە بوو. ئەو خەونە زیندووەکە بوو، خەونی پیاو بە ژنەوە.

هەنووکە ئەو توندوتۆڵ بە جادەکەدا دەڕۆیشت و قۆڵی لە قۆڵی مێردەکەیدا بوو. جلکی گرانتر لە جاران، بەڵام گنجرتر، بۆرژوازییانە دەینواند، شتێک لە نیگایدا کوژابووەوە و داخورابوو، هاوکات وەک ئەوەی زگی لەسەر سینییەکی نوێی زیو لە بەردەم خۆیدا هەڵگرتبێ، وەک ژنێکی قایلمەند دەینواند.

= گوندی قەشەنگەوە کە لە داستانەکانەوە هەڵگۆزراون و لەسەر کالۆس نەخشێنراون و پوتێمکین دایانان تا لە میانەی سەفەری خانمی سیزار بە نیوە دوورگەی کریمدا، بیانبینێت. و. کوردی

نا، من لەوە تێ ناگەم. بۆچ دەبێ ئاوها بێ، بۆچ دەبێ هەمیشە ئاوهای لێ بێت؟ بۆچ دەبێ خۆشەویستی پارەی سیحر بێت، کە بۆ ڕۆژی دواتر ببێتە گەلای ژاکاو، یان پیسیی یاخۆ بیرەنۆشین؟ لە پەرۆشی ئینساندا بەدوای خۆشەویستیدا هەڵبەت هەموو ئەم ڕووەی کولتوورەکە لکوپۆپی دەرکردووە، کە ناڕاستەوخۆ ئامانجی هێورکردنەوەی برسێتی و بەرگریکردن بووە لەبەردەم دوژمناندا. زەینی جوانیی ئێمە جگە لەوە چ سەرچاوەیەکی تری نییە. هەموو هونەرەکان، هەموو شیعرەکان، هەموو مۆسیقاکان لە ئاوی ئەو سەرچاوەیەیان خواردووەتەوە. ناقۆلاترین نیگارەکانی مێژووی مۆدێرن هەروەک مریەمەکانی ڕافایل(*) و کچە بچکۆلە پاریسییەکانی ستێینلێن(**)، "فریشتەی مەرگ" هەروەک بەستەی بەرز(***) و Buch der Lieder و کۆراڵ و ڤاڵسی ڤێنا(****)، بەڵێ هەموو زەخرەفە گەچییەکانی ئەم خانووە ناقۆلایەی کە منی تێدا دەژیم، هەموو فیگورێک لە کاخەزی دیوارەکانیدا، شێوەگەل لە گوڵدانە فەخفورییەکانی ئەوێدا و نەخشی سەر ملپێچەکەمدا، هەموو ئەوەی کە تەمای ڕازاندنەوە و جوانکردنی لێ دەکرێت، جا ئێستا سەرکەوتووبێت یان شکستی هێنابێ، نەسەبیان دەچێتەوە سەر ئەوێ، بەلام هەندێجار بە لاڕێی زۆر درێژدا. ئەمەش قسە دەرپەڕاندنی شەوانەی من نییە، بگرە سەدان جار سەلمێنراون.

بەلام ئەو سەرچاوەیە ناوی خۆشەویستیی نییە، بگرە پێی دەگوترێت: خەون

---

(*) : Rafaello Santi (١٤٨٢ -١٥٢٠)، نیگارکێشی بەنێوبانگی سەردەمی ڕێنیسانسی ئیتاڵیا. و.کوردی

(**) : Theophile Alexandre (١٨٥٩ -١٩٢٣)، نیگارکێشێکی فەرەنساییە و بە وێنە ساتیری و لیتۆگرافییەکانی بەنێوبانگە. و. کوردی

(***) :Höga visan کۆسرووودی خۆشەویستی و زەماوەند لە تەوراتدا، پێشتر بە هی سلێمان دەزانرا. و. کوردی

(****) Wienervals ڤاڵسێکی جوانە بە مۆسیقا و بە چۆنایەتییەکی هونەرییانەی بەرزەوە. و.کوردی

به خۆشەویستییەوە.

لەلایەکی ترەوە هەموو ئەو شتانەی پێوەندییان بە وەدیهاتنی ئەو خەونەوە هەیە، بە تێربوونی غەریزە و ئەوەی کە لەوە دەکەوێتەوە، لەبەردەم قووڵترین غەریزەکانماندا شتێکی درێو و بێ شەرمانەیە. ئەمە ناتوانرێت بسەلمێنرێت، ئەمە تەنیا هەستێکە: هەستی منە، لە ڕاستیدا پێم وایە هەستی هەموانیشە. بنیادەم هەمیشە وەک شتێکی نزم یان کۆمیدییانە مامەڵە لەگەڵ چیرۆکی خۆشەویستیی ئەوانی تردا دەکات و زۆرجار تەنانەت ڕیزپەڕ بۆ ئەوانەی خۆی ناکات. پاشان دەرەنجامەکانی... ژنێک لە دووگیانیدا شتێکی ترسناکە. ساوایەکی تازە لەدایکبوو قێزەونە. نوێنی مردن بە دەگمەن وەک منداڵبوون، وەک ئەو سەمفۆنیا ترسناکە لە زریکە و پیسی و خوێن، کارتێکردنێکی ئاوها زەندەقبەر جێ دێڵێت.

بەڵام یەکەمین و دوایین شت پرۆسەکە خۆیەتی. من هەرگیز ئەو یەکەمین جارەم بە منداڵی لەیاد ناچێتەوە کە لە حەوشی قوتابخانە و لەژێر یەکێک لە دارکەستانەکاندا گوێم لێ بوو هاوڕێیەکم باسی ئەوەی دەکرد کە "ئەوە چۆن دەکرێت". نەمدەویست باوەڕ بەوە بکەم، چەند کوڕێکی تر هاتن و ئەو قسەیەیان سەلماند و بە گێلێتیم پێکەنین، بەوەشەوە بە حاڵ باوەڕم کرد و زۆر بە تووڕەیی ڕام کرد. چما باوک و دایکم بەو شێوەیەیان کردووە؟ ئاخۆ منیش خۆم کە گەورە بووم هەر ئاوها دەکەم، ئاخۆ ناتوانم لە کۆڵ ئەوە ببمەوە؟

من هەمیشە هەستم بە ڕقێکی گەورە کردووە بەرامبەر ئەو کوڕە بەدانەی کە وشەی ناشیرینیان لەسەر دیوار و پەرژینی تەختەدارەکان دەنووسی. بەڵام لەو ساتەوەختەدا پێم وابوو کە خوا خۆی شتێکی ناشیرینی لەسەر ئاسمانە شینەکەی بەهار نەخشاندووە، لە ڕاستیدا پێم وایە ئەوە یەکەمین جاربوو کەوتمە ئەوەی بیربکەمەوە کە ئاخۆ هەر بە ڕاستیی چ خوایەک هەیە؟

هێشتا تا ئەوڕۆ بە تەواوی لەو سەرسامییەم نەهاتوومەتە دەرێ. بۆچ دەبێ بنەچە و دامرکاندنەوەی پەرۆشیمان ڕێک لەمیانەی ئۆرگانێکەوە بپارێزرێت

که له ڕۆژێکدا چەند جارێک وەک بۆری زێراب بۆ پیسایی بەکاردەبرێت، ئاخۆ بۆچ نەدەبوو ئەوە لەمیانەی ڕێوڕەسمێکەوە ئەنجامدرابا کە هاوکات لەگەڵ شەهوانییەتە باڵاکەدا ڕێزداری و جوانیی تێدابا؟ ئاخر ڕێوڕەسمێک کە بکرێ له کڵێسادا ئەنجام بدرێ و لەبەرچاوی هەمواندا، وەک ئەوە وایە کە لە تاریکی و تەنیاییدا بکرێت؟ یان لە پەرستگەیەکی گوڵ و لەبەر هەتاودا، لەنێو گۆرانی کۆرس و سەمای گرووپی ئاهەنگەکەدا.

**

نازانم چەندێکە بە ژوورەکەدا دێم و دەچم.

ئێستا دەرەوە ڕووناک بووەوە، کەڵەبابی کڵێسا(*) ڕووەو خۆرهەڵات بریسکە دەداتەوە، چۆلەکەکان برسی و تیژ جیکەیان دێ.

سەیرە کە هەمیشە بەر لە خۆرهەڵاتن لەرزێک لە هەوادا هەیە.

## ١٨ی یونی

ئەمڕۆ هەوا فێنکتر بوو، بە درێژاییی مانگێک بۆ یەکەمین جار پیاسەیەکی ئەسپ سواریم کرد.

چ بەیانییەک! شەوی ڕابردوو زوو چوومە نێو جێگە و بەدرێژاییی شەو نووستم. من هەرگیز ناتوانم بنووم و خەون نەبینم، بەڵام خەونەکانی ئەو شەوە شین و سووکەڵە بوون. بەرەو دەرەوەی هاگا و لە دەوروبەری پەرستگەی زایەڵەدا غارم دا و بەلای خێوەتی مسدا تێ پەڕیم. ئاورینگ و تەونی جاڵجاڵۆکە بەسەر هەموو تەڵان و بێشەکانەوە و وژەیەکی گەورە بەنێو

(*) kyrktuppen سیمبوڵێکە بۆ ئێشکگری و نزیکەی ٦٠٠ کڵێسای لە سوێد ڕازاندووەتەوە. ئەم سیمبوڵە دەوری بانوێنیش دەبینێت. لە سەدەی شازدەدا لە ئەورووپاوە هاتووەتە سوێد کە لەوێ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا باوی بووە. و. کوردی

درەختەکاندا دەهات. دێڤا[*] لە خۆشترین خوڵقیدا بوو، ئەرز لە ژێرماندا، جاحێڵ و ساخ وەک لە بەیانیی یەکشەمەی خوڵقاندا بێت، سەمای دەکرد. چوومە ڕێستۆرانتێکی بچووک، پێی ئاشنابووم ، بەهاری ڕابردوو لەمیانەی ئەسپ سوارییەکانی بەیانیانمدا زۆرجار لەوێ لام دەدا. دانیشتم و بوتڵێک بیرەم بە یەکجار هەڵقوڕاند، وەک لە بەستەکەدا هەیە: نێوقەدی کیژە چاو قاوەییەکەم گرت و پێچێکم پێ دا، پرچیم ماچ کرد و سوار ئەسپەکەم بووم.

## ١٩ی یونی

ئاوها خاتوو گرێگۆریۆس. کەواتە مەسەلەکە ئەمە بوو. ڕاستە، کەمێک نائاساییە.

ئەمجارەیان درەنگ وەختێک هات، کاتی سەردان تێ پەڕیبوو، ئەو بە تەنێ هەر خۆی لە ژووری چاوەڕوانی مابووەوە.

هاتە ژوورەوە بۆ لام، زۆر ڕەنگپەڕیو بوو، سڵاوی کرد و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستا. ئاماژەیەکم بۆ کورسییەک کرد، بەڵام ئەو هەر بەپێوە مایەوە.

گوتی: "ئەو جارە درۆیەکی گچکەم کرد. من نەخۆش نیم، تەواوێک لەش ساخم. ئەوە شتێکی ترە کە دەمویست لەگەڵ دوکتۆردا لەبارەیەوە بدوێم، تەنێ ئەوە بوو کە ئەوکات نەمدەتوانی بیدرکێنم".

عارەبانەیەکی بیرە تەقەتەق لە خوارەوە بە جادەکەدا تێ پەڕی، چوومە پێشێ و پەنجەرەکەم داخست، لەو بێدەنگییە ناکاوەدا گوێم لێی بوو کە نزم و توند، بەڵام لەگەڵ لەرەیەک لە دەنگیدا، وەک ئەوەی خەریک بێ کوڵی گریانی بەربێ، گوتی:

---

(*) Deva وشەیەکی سانسکریتییە. وشەیەکە بۆ خودا، خوایەتی. بە تایبەتی بۆ خودای ڕووناکی. و. کوردی

– قێزێکی زۆرم بەرامبەر مێردەکەم لەلا دروست بووە.

من ڕاوەستابووم و پشتم لە کوورەکە بوو، وەک ئاماژەیەک بۆ ئەوەی پیشانی بدەم دڵم لای قسەکانیەتی، سەرم داگرت. درێژەی دایێ:

– وەک مرۆڤ قێزم لێی نایەتەوە، ئەو بەرامبەرم هەمیشە باش و میهرەبان بووە، هەرگیز قسەیەکی ڕەقی پێ نەگوتووم. بەڵام بێ مەیلییەکی ترسناکم تێدا دەوروژێنێت.

هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژت. گوتی:

– نازانم چۆن بیڵێم. ئەوەی من گەرەکمە لە دوکتۆری داوا بکەم، شتێکی زۆر سەیرە، ڕەنگە لەگەڵ ئەوەدا نەیەتەوە کە ئێوە بە ڕاستی دەزانن. هەڵبەت من نازانم دوکتۆر لەبارەی ئەم جۆرە شتانەوە چۆن بیردەکەنەوە، بەڵام شتێک لە ئێوەدا هەیە متمانەم پێ دەبەخشێت، چ کەسێکی تریش ناناسم لەم مەسەلەیەدا پەنای بۆ بەرم، هیچ کەسێکی تر لەتەواوی ئەم دنیایەدا نییە بتوانێت یارمەتیم بدات. ئاخۆ دوکتۆر ناتوانێت لەگەڵ مێردەکەمدا قسان بکات؟ ناتوانن پێی بڵێن کە من گیرۆدەی جۆرێک نەخۆشیم، جۆرێک ئازاری بەروناوگەڵ، بۆیە دەبێ لە مافەکانی خۆی ببوورێت، لانی کەم بۆ ماوەیەک؟

مافەکان! دەستم نایە سەر نێوچەوانم. کاتێ دەبیستم ئەو وشەیە بەو واتایە باس دەکرێت، کەللەیی دەبم. خوای گەورە، چی بەسەر مێشکی خەڵکدا هاتووە، کاتێ ماف و ئەرکیان بۆ شتێکی وەک ئەمە داتاشیوە!

دەسبەجێ بۆم ڕوون بووەوە کە ئەگەر لەدەستم بێت دەبێ یارمەتیی ئەو ژنە بدەم، بەڵام یەکەندەردوو هیچم نەدۆزییەوە بیڵێم، دەمویست زیاتر گوێم لێی بێ. هەروەها ڕێشی تێ دەچێ کە هاوسۆزیم بەرامبەری ئامێتەبووبێ بە جورعەیەک پەیجۆریی ساکار و هاکەزایی. پرسیم:

– ببوورە خاتوو گرێگۆریۆس، ئێوە لە کەیەوە ژن و مێردن؟

– شەش ساڵە.

– ئەدی ئەوەی کە ئێوە ناوی دەنێن مافەکانی پیاو، ئایا پێشتر وەک ئێستا بەلاتانەوە قورس بووە؟

نەختێک سوور هەڵگەڕا.

گوتی: "هەمیشە هەر قورس بووە، بەڵام ئێستا بەم دواییە ئیدی پێم بەرگە ناگیرێت. ئیتر لەوە زیاتر لە توانامدا نەماوە، گەر ئەمە درێژە بکێشێت نازانم چیم بەسەر دێت".

دەسبەجێ گوتم: "بەڵام خۆ ئیدی قەشە گەنج نییە. سەرم سوڕماوە کە چۆن بەو تەمەنەوە هێند زۆر... ناڕەحەتتان دەکات؟ هەر بەڕاست تەمەنی چەندە؟".

– وا بزانم پەنجاو شەش ساڵ.. نەء، ڕەنگە پەنجاو حەوت بێت. بەڵام ئەو پیرتر دیارە.

– بەڵام خاتوو گریگۆریۆس پێم بڵێ ئایا ئێوە خۆتان لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە قسەتان لەگەڵدا نەکردووە؟ پێتان نەگوتووە کە چەند زۆر عەزابتان دەدا و جوان و هاوڕێیانە داواتان لێ نەکردووە لێتان گەڕێت؟

– با، جارێک داوای ئەوەم لێ کرد. بەڵام بە جۆرە هۆشدارییەکەوە وەڵامی دامەوە. گوتی ئێمە نەمانتوانیوە بزانین کە ئاخۆ خوا نیازی هەیە منداڵێکمان پێ ببەخشێت یان نا، بەڵام تا ئێستا نەمانبووە ، لەبەرئەوە گوناهێکی زۆر گەورەیە گەر واز لەو شتە بێنین کە خوا دەیەوێت بیکەین بۆ ئەوەی منداڵمان ببێت... خۆ ڕەنگە حەقی بێت. بەڵام بۆ من زۆر قورسە.

نەمتوانی زەردەخەنەیەک نەمگرێت. چ پیرەمێردێکی بێژی و ساختەچییە!

زەردەخەنەکەمی بینی، پێم وایە بە هەڵە لێکی داوەتەوە. بۆ چاوتروکانێک بەبێدەنگیی ڕاوەستا، وەک بڵێی بیربکاتەوە، ئەوسا کەوتەوە قسان، نزم و لەرزان، لە کاتێکدا کە سوورایییەکەی سەر ڕوخساری تۆختر و تاریکتر دەبوو. گوتی:

– نا، ئێوە دەبێ هەموو شتێک بزانن. دەشێ مەزەنەشتان کردبێت، هەڵبەت ئێوە دەتوانن بمخوێننەوە. خۆ کە من داواتان لێ دەکەم لەبەر من درۆی بچووک بکەن، دەبێ منیش لانی کەم لەگەڵتاندا ڕاستگۆبم. ئێوە چۆنتان پێ خۆشە هەڵم سەنگێنن. من ژنێکی خیانەتکارم. لەگەڵ پیاوێکی تردام. دەی هەر لەبەرئەوەشە کە ئەوە بۆ من ئاوها ترسناکانە قورسە.

کاتێ ئەوەی گوت، خۆی لە نیگام لادا. بەڵام من، من ئێستا هەر بە ڕاستی بۆ یەکەم جار ئەوم دەبینی. ئێستا بۆ یەکەم جار دەمبینی ژنێک لە ژوورەکەمدا ڕاوەستاوە، ژنێک بە دڵێکەوە پڕ لە هەوەس و بەدبەختی، گوڵە ژنێکی گەنج کە بۆنی عیشق بە دەوری خۆیدا دەپرژێنێ و لە شەرمدا سوورهەڵگەڕاوە، چونکە بۆنەکەی زۆر بەهێز و تیژ بووە.

هەستم کرد ڕەنگم دەپەڕێ.

دواجار سەری هەڵبڕی و ڕێکەوتی نیگامی کرد، نازانم چی تێدا خوێندەوە، بەڵام ئەو چی دی نەیدەتوانی خۆی لەبەردا ڕابگرێت، لەسەر کورسییەک دانیشت، لە حەژمەت گریان هەڵدەلەرزی. ڕەنگە پێی وابووبێ کە من هەموو ئەوەم بە شتێکی بەدڕەوشتی وەرگرتووە، هەروەها ڕەنگە پێی وابووبێت کە من بێباک و دڵڕەقم و ئەو بێ هوودە خۆی بۆ پیاوێکی بێگانە ڕووت کردووەتەوە.

چوومە پێشەوە بۆ لای، دەستیم گرت، بە ئەسپایی نەوازشم کرد: "ئارام بەوە، مەگری، لەوە زیاتر مەگری. من یارمەتیتان دەدەم. بەڵێنتان دەدەمێ".

– سوپاس، سوپاس...

دەستی ماچ کردم، بە فرمێسکەکانی تەڕی کرد. کوڵێکی تر گریا و ئیدی زەردەخەنەیەک لەنێو گریانەکەیدا پرشنگی دا.

منیش دەبوو زەردەخەنە بکەم. گوتم:

– بەڵام ئەم قسەیەی دواییتان گێلانە بوو، نەک لەبەرئەوەی بترسن کە من متمانەی ئێوە بەد بەکاردێنم، بەڵام دەبێ ئەو شتانە بە نهێنی بهێڵرێنەوە.

هەموو کاتێک بەبێ ڕیزپەڕ، تا ئەو شوێنەی کە بنیادەم دەتوانێ. بەهەرحاڵ من هەڵبەتە یارمەتیتان دەدەم.

وەڵامی دامەوە:

– حەزم دەکرد بیڵێم. حەزم دەکرد کەسێک بەوە بزانێت کە ڕێزێکی گەورەی دەگرم و پەسەنی دەدەم و سەرباقی ئەوەش سووکایەتیم پێ ناکات.

ئەوسا چیرۆکێکی درێژی لەبارەی ئەو متمانە بە من کردنەی گێڕایەوە: جارێکیان نزیکەی ساڵێک لەوەوبەر لەمیانەی وتووێژیکی نێوان من و مێردەکەیدا، قەشە تەندروستیی خراپ و منیش لەوێ لە سەردانی بووم. قسانمان لەبارەی لەشفرۆشییەوە کردووە. هەموو ئەو قسانەی لەیادبوو کە من کردبوومن و بۆی دووبارەکردمەوە – شتێکی زۆر سادە و ساکار بوو، خۆ ئەو کیژە بەستەزمانانەش ئینسانن و دەبێ وەک ئینسان مەمەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و...هتد. بەڵام ئەو پێشتر هەرگیز گوێی لێ نەبووبوو کە کەسێک ئاوها بدوێت. ئیدی پاش ئەوە پەسەنی داوم. ئەوە لەبەرئەوەیە کە ئێستا ئازایەتی گرتوویەتی متمانەم پێ بکات.

من هەر هەموو ئەو قسانەم بیرچووبوونەوە... دەی ئەوەی ئەمڕۆ نهێنی بێت، سبەی هەر ئاشکرا دەبێت(*).

بەو شێوەیە بەڵێنم پێ دا کە هەر هەمان ڕۆژ قسان لەگەڵ مێردەکەیدا بکەم و ئیدی ئەو ڕۆیشت. بەڵام دەسکێش و چەتری خۆرگرەکەی لەبیرچوو، گەڕایەوە و بردنی و هەمدیس بزربوو. پرشنگی دەدا و گەشابووەوە، وەک منداڵێک شادمان و هێڕ بوو کە خواستی خۆی دەربڕیوە و لە چاوەڕوانیی شتێکی زۆر خۆشدایە.

**

پاش نیوەڕۆ چووم بۆ ئەوێ. بەپێی بەڵێنەکەمان مێردەکەی ئامادە کردبوو.

---

(*) ئەمە لە دەقە سوێدییەکەدا ئیدیۆمە و ئاوهایە: ئەوەی لە بەفردا بشاردرێتەوە لە تەڕاییدا دەردەکەوێتەوە. و. کوردی

له ژوورێکی جیادا قسانم لەگەڵدا کرد. ڕوخساری لەکاتی ئاسایی گریاناویی تر بوو. گوتی:

– بەڵێ، ژنەکەم پێشتر بۆی باس کردووم مەسەلەکە چۆنە. ناتوانم بڵێم کە چەندێک بۆی نیگەرانم. ئێمە لە ناوەوەڕا ئومێدەواربووین و ئاواتمان دەخواست منداڵێکی گچکەمان پێ ببەخشرێت. بەڵام دەبێ بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە بڵێم کە من ژووری جیاوازم پێ قەبووڵ نییە. ئەوە لای جەماعەتەکەی ئێمە شتێکی زۆر نائاساییە و تەنێ بیانوو دەداتە دەست بۆ وتیوتی. سەرەڕای ئەوەش من پیاوێکی پیرم.

دەسکردانە کۆکی.

گوتم: "بەڵێ، هەڵبەتە من گومانم لەوە نییە کە قەشە تەندروستیی ژنەکەیان دەخەنە پیش هەر شتێکی ترەوە. وەکی تر ئومێدێکی زۆر هەیە بتوانین هەمدیس تەندروستیی چاک بکەینەوە".

وەڵامی دامەوە: "ئەوە شتێکە کە من لە خوا بۆی دەپاڕێمەوە. بەڵام جەنابی دوکتۆر پێی وایە ئەوە چەندێک دەخایەنێت؟".

– گوتنی ئەوە قورسە. بەڵام بە دڵنیاییەوە نیو ساڵ پارێز شتێکی پێویستە. پاشان بزانین چۆن دەبێ...

دوو پەڵەی پیسی قاوەیی بە ڕوخسارەوە بوو، پەڵەکان هەنووکە لەسەر ڕوخسارە ڕەنگپەڕیوەکەی تۆختر و ئاشکراتر دیاربوون، چاوانیشی پێ دەچوو چووبێتنەوە یەک.

**

قەشە پێشتر جارێک ژنی هێنابوو. زۆر حەیف کە یەکەمین ژنی مردبوو! لە ژووری کارەکەیدا پۆرترێتێکی گەورەکراوی وی لە چوارچێوەیەکی گەچیی ڕەشدا هەڵواسراوە : شێوە کارەکەرێکی ساکار و ئێسک دەرپەڕیو و خواناس، کە جیاوازییەکی ئێجگار زۆری لەگەڵ کاتارینا ڤۆن بورای میهرەباندا نییە.

بە دڵنیاییەوە بۆ قەشە گونجاو بوو. حەیف کە مردبوو.

## ۲۱ی یونی

بڵێی ئەو پیاوە بەختەوەرە کێ بێت؟ لەپێرێوە ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم.

سەیرە وا زوو بە زوو وەڵامی ئەو پرسیارەم زانی، هەروەها سەیریشە کە ئەو کەسە ڕێک گەنجێکە هێشتا بە شێوەیەکی هاکەزایی دەیناسم. ئەو کەسە "کلاس ڕێکێ" یە.

بەڵێ، بەڵێ، لە ڕاستیدا ئەو کەسێکی تەواو جیاوازە لە قەشە گریگۆریۆس. لەو گەرما ڕۆژییەی خۆرنشیندا بەبێ مەبەست بە جادەکاندا دەڕۆیشتم و بیرم لەو، لەو ژنە گچکەیە دەکردەوە. زۆرجاران بیری لێ دەکەمەوە. چوومە جادەیەکی چۆڵ و پەڕەوە، کتوپڕ بینیمن کە بەرەوڕووی من دێن. لە دەروازەیەکەوە دەهاتنە دەرێ. دەستوبرد دەسەسرێکم دەرکێشا و فنگم کرد تا دەموچاوم بشارمەوە. باوەجوو ئەوە شتێک بوو پێویست نەبوو، هەڵبەت پیاوەکە بەحاڵ دەیناسیمەوە و ژنەکەیش نەیدەبینیم، ئاخر ئەو لە بەختەوەریدا کوێر بووبوو.

## ۲۲ ی یونی

دانیشتووم و ئەو پەڕەیە دەخوێنمەوە کە دوێنێ عەسر نووسیومە، دەیخوێنمەوە و هەمدیس دەیخوێنمەوە، بە خۆم دەڵێم: ئاوها، هاوڕێی پیر، کەواتە تۆیش بوویتە گەواد. قسەی قۆڕ. من ئەو ژنەم لە شتێکی ترسناک ڕزگارکرد، هەستم کرد ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت، ئەنجامم دا.

ئیدی ئەو بۆ خۆی چ دەکات، ئەوە شتێکە پێوەندیی بە خۆیەوە هەیە.

## ۲۳ی یونی

شەوی چلەی هاوین. شەوی ڕووناک و شین. تۆم بیردێتەوە لە تافی منداڵی و جحێڵییەوە وەک سووکەڵەترین و سەرحاڵترین و ڕووناکترین شەوەکانی ساڵ،

ئەدی بۆچی ئێستا هێند خەفە و نیگەرانکەریت؟

لای پەنجەرەکەوە دادەنیشم و بیر لە ژیانی خۆم دەکەمەوە، لە دووی ئەو هۆیەم کە بۆچی ژیانم بە ڕێگایەکی تەواو جیاواز لە ڕێگای خەڵکانی تردا دەڕوات و بۆچی هێند لە ڕێگەی گشتی دوور کەوتووەتەوە.

لێ گەڕێ با بیربکەمەوە.

تازەکی کە بە گۆڕستانەکەدا بۆ ماڵەوە دەهاتمەوە، هەمدیس یەکێک لەو دیمەنانەم بینی کە هەمیشە بیروڕانێرە مۆراڵییەکان لە ڕۆژنامەکاندا دەڵێن: بە کەڵکی باس نایەت. ئاشکرایە ئەو غەریزەیەی ئەو خەڵکە بەستەزمانە قەناعەت پێ دەکا، کە لە گۆڕستانێکدا تووڕەیی خەڵک بورووژێنن، دەبێ غەریزەیەکی بێ ئەندازە توند و بەهێز بێت. ئەو غەریزەیە پیاوانی بێ دەربەست بەرەو هەموو تەرزە شێتییەک دەهاژوات، پیاوانی ئابڕوومەند و ئاقڵیش بەرەو ئەوە دەهاژوات کە لەبەر ڕێزی خەڵکی، خۆ ببەنە ژێر نەهامەتی و مەحروومییەتی گەورەوە. ئەو غەریزەیە ژنانیش دەهاژوێت بەرەو ئەوەی بەسەر ئەو هەستی شەرمەدا زاڵ بن، کە پەروەردەکردنی کچان نەوە دوای نەوە لەسەر بێدارکردن و بەهێزکردنی ڕۆنراوە، تا بەرگەی عەزابی جەستەیی گەورە بگرن و زۆرجار بە سەردا خۆیان هەڵدێرنە ناو بەدبەختییە قووڵەکەوە.

ئەوە هێشتا تەنیا منی بەرەو هیچ شتێک نەهاژوتووە. ئەدی باشە چۆن؟

هەستەکانی من درەنگ بێداربوونەوە و ئەوە لە کاتێکدا بوو کە ئیرادەم ئیرادەی پیاوێک بوو. من بە منداڵی زۆر شکۆویست بووم. زۆر زوو بە خۆکۆنترۆڵکردن ڕاهاتم، بۆ ئەوەی جیاوازی بکەم لە نێوان حەزی ناوەوە و نەگۆڕم لەگەڵ حەزی ساتەوەختی، ئارەزووی ئانی، دەبوو گوێ ڕادێرم لەو دەنگەی یەکەم و ئەوی تریشیان بەکەم ببینم. دواتر سەرنجم دا کە ئەمە تا ڕادەیەک شتێکی دەگمەنە لە نێو خەڵکدا، دەشێ دەگمەنتر لە بەهرە و بلیمەتی، لەبەرئەوە هەندێ جار وا دێتە بەرچاوم کە دەبوو من ببوومایەتە شتێکی نائاسایی و گرنگ. هەڵبەتە من لە قۆناخی قوتابخانەش خاوەن

درەوشانەوەیەکی گەورە بووم، هەمیشە لە پۆلدا کەم تەمەنترینیان بووم، لە پازدە ساڵیدا قوتابیی پزیشکی و لە بیست و سێشدا بوومە دوکتۆر. بەڵام لەوێدا ڕاوەستام، نە بەردەوامبوون لە خوێندنی پسپۆری و نە نامەی دوکتۆرا. هەڵبەتە خەڵک حەزیان دەکرد پارەم بە قەرز، تا ڕادەیەک چەندم ویستبا، بدەنێ، بەڵام من ماندوو بووم. چ ئارەزوویەکم نەبوو خۆم پسپۆڕتر بکەم، دەمویست نانی خۆم پەیدا بکەم. شکۆویستیی تافی قوتابیەتی بەدوای بڕوانامەی جواندا ڕەویبووەوە و مردبوو، هەڵبەت سەیربوو کە لەبری ئەوە شکۆویستیی پیاوێک جێی نەگرتەوە. پێم وایە ئەوە لەبەرئەوە بووە کە ئیدی کەوتبوومە بیرکردنەوە. جاران کاتم بۆ ئەوە نەبوو.

بەڵام لە هەموو ئەو ماوەیەدا ژیانی غەریزیم لە نیوە وەنەوزدا بوو، هەڵبەت هێند زیندوو بوو کە نادیارترین خەون و تامەزرۆیی بێدار بکاتەوە، وەک لای کیژێکی گەنج، بەڵام بەهێز و ناچارکەر نا، وەک لای کوڕانی گەنجی تر. هەروەها ئەگەر من جاروبار شەوێک لە فانتاسیای گەرمدا وەئاگا بووبمەوە، هەمیشە وا هاتووەتە بەرچاوم کە جێی بیر لێکردنەوە نییە بتوانم داسەکنێن لای ئەو ژنانە بدۆزمەوە کە هاوڕێکانم سەردانیان دەکردن، ژنانێک کە جاروبار هاوڕێکانم لە شەقامەکاندا پیشانیان دەدام و بێزارییان تێدا دەوروژاندم. هەروەها ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە فانتاسیای من هەمیشە تا رادەیەک بەتەنیا هەر خۆی و بە خۆی ئاگای لە خۆی بێت، بەبێ هیچ مامەڵەکردنێک لەگەڵ فانتاسیای هاوڕێیاندا. ئاخر من هەمیشە زۆر لەوان گەنجتر بووم، لە سەرەتادا کاتێک ئەوان باسی ئەو جۆرە شتانەیان دەکرد من هیچ حاڵی نەدەبووم، لە کاتێکیشدا کە هیچ حاڵی نەدەبووم، خۆیشم ڕاهێنا گوێیان لێ ڕانەدێرم. ئیدی ئاوها بە "پاکی" مامەوە. تەنانەت هیچ کاتێک لەگەڵ گوناهگەلی کوڕوکاڵدا نەبوومە ئاشنا، تەنانەت بەحاڵ دەمزانی ئەوە چییە. چ باوەڕێکی ئاینیم نەبوو گلم بداتەوە، بەڵام خەونگەلێکم لەبارەی عیشقەوە چنیبوون، ئای، چ خەونگەلێکی جوان، دڵنیابووم جارێک لە جاران وەدی دێن. نەمدەویست مافی بە نۆبەرەیی لەدایکبوونم، لەپێناو محەلەبییەکی

دانەوێڵە(*)دا بفرۆشم، نەمدەویست کڵاوە نەرمە سپییەکەم پیس بکەم.

جارێکیان پێم وابوو خەونەکانم لەبارەی ئەڤینەوە هێند نزیکن، هێند نزیکن کە خەریکە بێنە دی. ئەی شەوی چلەی هاوین، ئەی شەوە ڕەنگ پەڕیوە سەیرەکە، هەمیشە تۆ ئەو یادەوەرییەم تێدا وەئاگادێنیت، یادەوەرییەک کە تاقە شتێکی ژیانمە، تاقە شتێک کە دەمێنێتەوە، لەکاتێکدا کە هەموو شتەکانی تر ڕۆدەچن و دەبنە تۆزوخۆڵ و دەبنە هیچ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی کە ڕووی دا شتێکی زۆر بێ بایەخ بوو. لە پشووی چلەی هاویندا بۆ خانووەکەی خاڵم لە گوند چووبووم. جحێلی و سەما و یاری. لەنێو پێڕی گەنجاندا کیژێک هەبوو کە پێشتر چەند جارێک لە داوەتی خێزانەکاندا بینیبووم. پێشتر هەرگیز بیرم لێ نەکردبووەوە، بەڵام ئێستا کە لەوێ بینیم، لەناکاوێکڕا ئەو قسەیە ڕژایە زەینمەوە کە جارێکیان هاوڕێیەکم لە داوەتێکدا لەبارەیەوە پێی گوتم: "ئەو کیژە چاوی سۆزی لە سەرتە، بەدرێژایی شەو دانیشتبوو تەماشای دەکردیت". ئێستا ئەوەم بیرهاتەوە، بەڵام مەسەلەکەم بە جیدی وەرنەگرت، بەهەرحاڵ ئەوە وای لێ کردم کە زیاتر تەماشای بکەم، دەنا گەر ئەو مەسەلەیە نەبایە ئەوا ئاوها تەماشام نەدەکرد، سەرنجم دا ئەویش جاروبار تەماشام دەکات. دەشێ ئەو لەوانی تر جوانتر نەبووبێ، بەڵام گوڵی گەشی بیست ساڵەیی بوو، بلوسێکی تەنکی بەسەر مەمکۆڵە تازەکی غونچەکردووەکانیدا لەبەرکردبوو. چەند جارێک بە دەوری ئەستوندەکی مای(**)دا سەمامان کرد. دەمەو نیوەشەو هەموومان پێکەوە سەرکەوتینە سەر چیایەک تا لە دیمەنەکانی ئەو ناوە بنۆڕین و ئاگرێکی ناوەڕاستی هاوین بکەینەوە، مەبەستمان بوو تا هەتاوکەوتن لەوێ بمێنینەوە. ڕێگاکە بەنێو دارستانێکی نێوان دارسنۆبەری بەرز و ڕێکدا تێ دەپەڕی، دوو دوو

---

(*) مافی نۆرەبڕیی کوڕە گەورە لە بابەتی وەک میرات و شتی تر لە دیانەتی جوولەکەدا. و. کوردی

(**) Majstangen: ستوونێکی دارینە و بە گوڵ دەڕازێنرێتەوە و لە سوێد وەک نەریت لە ڕۆژی ناوەڕاستی هاویندا بە دەوریدا سەما دەکرێت. و. کوردی

دەڕۆیشتین و منیش لەگەڵ ویدا. کاتێک لە تاریکاییی دارستانەکەدا قاچی لە ڕەگی درەختێک هەڵەنگاوت، من دەستم بۆ ڕایەڵ کرد، کاتێ دەستم بەر دەستە گچکە نەرم و توندوتۆڵە گەرمەکەی کەوت لە دەستمدا، لەرزێکی توند لە شادمانی بە جەستەمدا هات و کاتێ ڕێگاکە هەموار و هاسانیش بووەوە، من دەستیم هەر لە نێو دەستی خۆمدا هێشتەوە. ئەدی باسی چیمان دەکرد؟ نازانم، یەک تاقە وشە چییە لە زەینمدا نەماوەتەوە، تەنێ ئەوەم لەیادە کە تەزوویەکی شاراوە لە خۆبەختکردنێکی بێدەنگ و جەسوورانە بە دەنگ و بە هەموو وشەکانیدا دەهات، وەک ئەوەی دەمێک بێ خەونی بە م ڕۆیشتنەیەوە لە دارستاندا لەگەڵ مندا بینیبێ و ئاواتی بۆ خواستبێ. سەرکەوتینە سەر شاخەکە، جحێڵەکانی تر بەر لە ئێمە گەیشتبوونە ئەوێ و ئاگرەکەیان کردبووەوە، لێرە و لەوێ خۆمان کردە گروپ گروپ و دوو دووەوە. لە بەرزایی و چیاکانی ترەوە ئاگری تر بڵێسەی سەندبوو. فەزا بەسەر سەرمانەوە گەورە و ڕووناک و شین هەڵواسرابوو، لە خوارەوە کەنداو و تەنگە و کەندرۆ بەرفراوانە شەختەبەندەکە پرشنگی دەدا و قووڵ دەچووەوە. هێشتا هەر دەستیم لەنێو دەستمدا هێشتبووەوە، پێم وایە جورئەتیشم کرد بە ئەسپایی نەوازشی بکەم. دزەنیگایم دەکرد و بینیم ڕوخساری لە سپیچۆڵکیی شەودا هەڵایساو و چاوانی لێوڕێژن لە ڕۆندک، بەڵام نەدەگریا، هاوسەنگ و هێور هەناسەی دەدا. بێدەنگ دانیشتین، بەڵام لە ناوەوەمڕا گۆرانیم دەگوت، بەستەیەکی دێرین کە نازانم چۆناوچۆنی بۆم هات:

ئاگرێک دەسووتێ، هێند ڕۆشن دەسووتێ، وەک هەزار تاجەگوڵێن بڵێسە دەدا

ئاخۆ دەبێ خۆم بە ئاگرەکەدا بکەم و لەگەڵ ئازیزترین کەسمدا بکەومە سەما؟

قەیرێکی درێژ ئاوها دانیشتین. تاک و تەرا ئەوانی تر هەڵدەسان و بەرەو ماڵەوە دەبوونەوە، گوێم لێ بوو یەکێک گوتی: هەورێکی گەورە لە خۆرهەڵاتدایە، چ هەتاوکەوتنێک نابینین. گرووپەکە ڕەوییەوە، بەڵام ئێمە

مـاینەوە، دواجار هـەر خـۆمـان بە تەنیا بووین. قـەیرێکی درێژ تەماشایم کـرد و ئەو بەردەوام ڕێکەوتی نیگامی دەکـرد. ئەوسا سـەریم نایە نێو دەستـمـەوە و مـاچیم کرد، مـاچێکی سـووک و بێ ئەنگـیزە. هەر لەوکـاتەدا کەسێـک بانگی ئەوی کرد، ڕاچڵـەکی، خۆی ڕەها کرد و ڕای کرد، سووکەڵە بە دارستـانەکەدا بە ڕاکردن بەرەو خوار بووەوە.

کـاتێ پێـی گـەیشـتـمـەوە ئیدی ئەو لە نێـو ئەوانی تردا بوو، تەنێ تـوانیم بە بێـدەنگی دەسـتـی بگوشـم و ئەویش دەسـتـی گـوشـیـمـەوە. لە خـوارەوە لە مێـرگـەکـەدا هێـشـتـا سـەمـا بـە دەوری ئەسـتـووندەکی مـایدا درێژەی هـەبوو، گەنجـانی سـەر بە خـێزانی کارەکـەر و سـەپان و خـانەدان، وەک نـەریت لەو تاقە شـەوەی سـاڵدا لەگـەڵ یەکدیدا سـەمـایان دەکرد. من هـەمـدیس سـەمـام لەگـەڵ ئەودا کـردەوە، سـەمـایەکی تـوند و بە گـێـژەن، دنـیـا ئیـدی بـە تەواوی ڕۆژ بووبووەوە، بـەڵام ئەفـسـوونی شـەوی ناوەڕاسـتی هـاوین هێـشـتـا لە هـەوادا مابوو، هـەموو ئەرز لەژێرمـاندا سەمای دەکرد، جووتەکـانی تر گا بەرز بە سـەر سـەرمـانەوە و گـا لەژێری ژێرمـانەوە بە لامـاندا وژەیان دەهات، هـەمـوو شـتێک خـوار و ژێری دەکرد و دەسـووڕایەوە. ئەوسـا دواجـار لەو گـێژەنی سـەمـایە هاتینە دەرێ، نەماندەوێرا تەماشای یەکدی بکەین، بەڵام پێکەوە دزەمان کردە ئەودیو پەرژینی یاسوەنەوشێکەوە. لەوێ هەمدیس ماچیم کردەوە. بەڵام ئێستا شـتێکی تر بوو، سـەری لەسـەر باسکم بوو، چاوانی لێک نابوون، زاری لەژێر ماچەکەمدا بووبووە بوونەوەرێکی زیندوو. دەسـتم نایە سـەر سینگی و گوشیم، هـەستم کرد ئەو دەستی نایە سەر دەستم، دەشێ ویستبێتی بەرگری لە خۆی بکات و دەستم لابەرێت، بەڵام لە ڕاستیدا توندتر لەسـەر سینگی خۆی گوشی. بەڵام لەو مـاوەیەدا بریسکەیەک ڕوخسـاری گرتەوە، یەکـەمجار بێ تـین، پاشان بەهێـزتر، دواجـاریش وەک شـەوقی ئاگرێکی بە لرفـە، چـاوانی کـردنەوە، بەڵام ناچاربوو هـەمـدیس بە شـەوارەکـەوتووانە لێکیـان بنێ، کـاتێکیش دواجـار ئەو ماچە درێژەمان کـرد، گۆنا لەپاڵ گۆنادا ڕاوەستاین و واقـوڕماو، ڕێک چاومان لە خۆر بڕی کە لە خۆرهـەڵاتەوە لەمیانەی گەواڵە هـەورەکانەوە دەهاتە دەرێ.

پاش ئەوە ئیتر هەرگیز جارێکی تر نەمبینییەوە. ئەوە دە ساڵ لەمەوبەر بوو، ئەمشەو ڕێک دەبێتە دە ساڵ، کەچی ئەمڕۆ کاتێ بیر لەوە دەکەمەوە، نەخۆش دەکەوم و شێت دەبم.

چ وادەیەکمان بۆ ڕۆژی دواتر دانەنا، بیرمان لەوە نەکردبووەوە. دایک و باوکی لە جێگایەکی ئەو نزیکانە دەژیان، ئیدی ئێمەش ئەوەمان بە شتێکی بەڵگەنەویست دەزانی کە یەکدی دەبینینەوە و ڕۆژی دواتر، هەموو ڕۆژەکان، بە درێژاییی ژیان پێکەوە دەبین. بەڵام ڕۆژی دواتر باران بوو، تێ پەڕی بەبێ ئەوەی بیبینم، ئێوارەکەشی دەبوو بۆ شار سەفەر بکەم. لەوێ دوو ڕۆژ دواتر لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە کە ئەو مردووە. لەکاتی مەلەدا خنکاوە، ئەو و کچێکی گەنجی تر.

بەڵێ، بەڵێ، ئەوە دە ساڵ بەر لە ئێستا بوو.

یەکەمجار خەفەتبار بووم، بەڵام لە ڕاستیدا من خاوەن سروشتێکی تا ڕادەیەک بەهێز بووم. وەک جاران کارم دەکرد، لە پایزدا بڕوانامەکەم وەرگرت. بەڵام ئازاریشم دەچەشت. شەوانە دەهاتە بەرچاوم، بەردەوام. جەستە سپییەکەیم دەبینی کە کەوتبووە نێو هەرزەی ئاو و لیتاوەوە و لە ئاوەکەدا بەرز و نزم دەبووەوە. چاوانی تەواوێک کرابوونەوە، دەمیشی کە من ماچم کردبوو، هەر کرابووەوە. ئەوسا خەڵک بە بەلەمێک، بە لەنگەرۆکەیەکەوە هاتبوون. لەنگەرۆکەکە چەنگاڵی لە سینگی گیر کردبوو، چنگاڵی لە هەمان ئەو سینگە گەنجە کچانەیە گیرکردبوو، کە من تازەکی گوشیبووم.

دوای ئەوە کاتێکی زۆری ویست تا ئیدی من هەمدیس هەست بکەم کە پیاوم و ژنان لە جیهاندا هەن. بەڵام من ئیدی خارا بووبووم. ئێستا من هەڵبەت یەک جار هەستم بە شەرارەیەک لە بڵێسە گەورەکە کردبوو، لە هەر کاتێکی تر کەمتر مل بدەم کە بە ئەڤینی مسین(*) قایل بم. جا ئیتر با خەڵکانی تر لەم خاڵەدا کەمتر ورد بن، ئەوە گرفتی خۆیانە، ناشزانم کە ئاخۆ

(*) مەبەست لە ئەڤینێکی ساختە یان سادەیە. و. کوردی

هەموو مەسەلەکە چ مانایەکی گەورەی هەیە. بەڵام هەستم کرد بۆ من مانای هەیە. هەڵبەت شتێکی نەفامانەیە باوەڕ بکرێت بەوەی ئیرادەی ئینسان، ئەگەر تەنیا ئەو ئیرادەیە لەوێدا هەبێت، ناتوانێ ئەو شتە بێ بایەخانە یاسابەندی بکات. ئەی مارتین لۆتەری خۆشەویست، ئەی مامۆستا بەڕێزەکەی قەشە گریگۆریۆس، دەبێ چ گوناهبارێکی ناجسن بووبیت، چونکە کاتێ گەیشتیتە ئەو فەسڵە، قسەی تووڕەهاتت زۆر کرد. بەڵام تۆ لە موریدەکانی ئەم زەمانەت ڕاستگۆتر بوویت، ئەمەش شتێکە کە دەبێ مرۆڤ هەمیشە بۆت حیساب بکات.

ئاوها ساڵ لەدوای ساڵ تێ دەپەڕی و ژیانم بەهەدەر دەچوو. ژنانێکی زۆرم بینین، کە سەرلەنوێ پەرۆشیمیان هەڵایساند، بەڵام ڕێک هەر ئەو ژنانە هەرگیز سەرنجیان نەدام، هەروەک ئەوەی من لای ئەوان شتێک لە جێی نەبووان بم. چۆن ئاوها بوو؟ وا بزانم ئێستا لەوە حاڵی دەبم. ژنێک کە عیشق دەکا، ڕێک ئەو سیحرەیە بەسەر ڕۆیشتن و ڕوخسار و بەسەر هەموو وجوودییەوە، کە یەخسیرم دەکات. هەمیشە ئەو تەرزە ژنانە بوون کە هەوەسیان داگیرساندووم. بەڵام لەبەرئەوەی کە عاشقانی پیاوانێکی تر بوون، دیارە بۆیە نەیانتوانیوە من ببینن. لە بەرامبەردا ژنانێکی تر تەماشایان کردووم، من هەڵبەت دوکتۆرێکی گەنج بووم و هەر لەسەرەتاشەوە خاوەن کلینێکێکی باش، بەو چەشنە مەزەندەم وەک هاوسەرێکی نایاب کراوە و بێگومان بوومەتە کەرەستەیەک بۆ پەیجۆرییەکی زۆر. بەڵام ئێستا ئیدی ئەو ڕەنجە بۆ هەمیشە بەخەسار چووە.

بەڵێ ساڵەکان تێ دەپەڕین و ژیانم بەهەدەر دەچوو. ئەرکی سەر شانی خۆم بەجێ دەهێنم. خەڵکی بە نەخۆشییەکانیانەوە لە هەموو بابەتێک دێن بۆ لام، منیش چەندێک لە توانامدا هەبێت چارەسەریان دەکەم. هەندێکیان چاک دەبنەوە، هەندێکی تریشیان دەمرن، زوربەیان بە دەردەکانیانەوە خۆیان کێش دەکەن. من چ موجیزەیەک لە چارەسەرکردندا نانوێنم، تاک و تەرا کە نەمتوانیوە یارمەتییان بدەم، لەلای منەوە بۆ لای پیرەمێردی ئاقڵ و

کەڵەکبازانی ناوزڕاو چوون و چاک بوونەتەوە. بەڵام من پێم وایە کە خەڵکی بە پزیشکێکی بەویژدان و وریام دەزانن. هەڵبەت بە زوویی پزیشکێکی خێزانیی نموونەییم، پزیشکێک بە ئەزموونی گەورە و نیگای هێور و متمانە وروژێنەوە. دەشێ خەڵکی متمانەیان کەمتر پێم بێت، گەر بزانن چەند خراپ دەنووم.

ئەی شەوی ناوەڕاستی هاوین، ئەی شەوی شینی ڕووناک، خۆ تۆ جاران سووکەڵە و بەرفراوان و خومار بوویت، ئەدی هەنووکە بۆچی وەک پەژارەیەک خۆت بەسەر سینگمدا داداوە؟

## ٢٨ی یونی

لە ئێوارە پیاسەکەی عەسرمدا بەلای ئوتێلی گراندا تێ پەڕیم، لەوێ کلاس ڕێکێ لەسەر مێزێکی سەر شۆستەکە، بە تەنیا بە ویسکییەکەیەوە دانیشتبوو. چەند هەنگاوێکی تر بەردەو ام بووم لە ڕۆیشتن، ئەوسا گەڕامەوە و لەسەر مێزێکی نزیکییەوە دانیشتم تا سەرنجی بدەم. ئەو منی نەدەبینی، یان نەیدەویست بمبینێت. بێگومان دەشێ ژنەی داماو باسی من و سەردانی خۆی بۆ لای من و دەرەنجامە بەختەوەرانەکەی بۆ کردبێ و دەشێ لەو ڕووەوە سوپاسگوزارم بێت، بەڵام ڕەنگە ئەوە کەمێک ناخۆشحاڵی کردبێت کە زانیبێتی نهێنییەکە بۆ کەسێک درکێنراوە. ئەو بێ جووڵە دانیشتبوو، لە سێڵاوەکەی دەنۆڕی و سیگارێکی زۆر درێژ و باریکی دەکێشا.

کوڕە ڕۆژنامەفرۆشێک لەوێوە تێ پەڕی، من ڕۆژنامەیەکی ئافتونبلادێت(*)م کڕی تا وەک پۆشاکی بەرگری بەکاری بهێنم و لەلاکانییەوە تەماشای بکەم. هەمان خایلەم بۆ هاتەوە کە ساڵانێکی زۆر لەوەوبەر کاتێ بۆ یەکەمجار ئەوم بینی، تێمدا وروژابوو: بۆچی ئەم پیاوە ڕێک ئەم ڕوخسارەی هەیە کە دەبوو

---

(*) Aftonbladet: ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەیە و ساڵی ١٨٣٣ لەلایەن لارش یۆهان هیێرتاوە وەک ئۆرگانێک بۆ سیاسەتی لیبراڵ دامەزرا و دواتر هەڵوێستی سیاسیی جیاوازی لە خۆگرت. و. کوردی

من هەمبوایە؟ گەر بمتوانیبا ڕوخساری خۆم دروست بکەم، ئەوا تا ڕادەیەک بەو شێوەیە دروستم دەکرد. من لەو کاتەدا زۆر عەزابم بەوەوە دەچەشت کە وەک شەیتان ناشیرینم. ئێستا ئەوە چ گرینگییەکی بەلامەوە نییە.

من بە ئاستەم پیاوی لەو جوانترم بینیوە. چاوانێکی سارد و خۆڵەمێشییەکی کاڵ، بەڵام لە چوارچێوەی ڕوخساریدا، خەوناوی و قووڵ وەدیار دەکەون. برۆی تەواوێک ڕێک و ئاسۆیی کە بەرەو لاجانگەی درێژبوونەتەوە. نێوچەوانێکی سپی مەڕمەڕی. قژێکی ڕەش و پڕ. بەڵام لە نیوەکەی خوارەوەی ڕوخساریدا تەنیا دەمی تاقە شتێکە کە تەواوێک جوانە، دەنا چەند شتێکی نەشازی تێدا هەن، کەپوویەکی نائاسایی، پێستێکی ڕەش وەک بلێی سووتابێت، بە کورتی هەموو ئەوەی پێویست بێت ئەو هەیەتی تا خۆی لەو جۆرە جوانییە بێ خەوشە پێ ڕزگار بکات کە زۆر جار گاڵتەجاڕی دەوروژێنێت.

ئەدی ئەم پیاوە لە ناوەوەڕا چۆنچۆنییە؟ هیچ شتێک لەوبارەیەوە نازانم. تەنها دەزانم کە لە ڕووی سەرکەوتن لە کارو وەدەستهێنانی پلەوپایەدا، کەسێکی ئێجگار زیرەکە، بیرمە وا بزانم زیاتر لەگەڵ کاربەدەستانی بالادەستی ئەو وەزارەتەدا بینیومە کە ئیشی تێدا دەکات وەک لەگەڵ هاوڕێ هاوتەمەنەکانی خۆیدا.

کاتێ تەماشایم دەکرد لەوێدا بێ جووڵە دانیشتبوو، سەرنجی لە جێگایەکی نادیار دابوو، دەستی بۆ پەرداخەکەی نەدەبرد و خەریک بوو سیگارەکەی دەکوژایەوە، سەدان بیر و خایلەم بۆ هات. کاتێ بیرم لەو ژیانە دەکردەوە کە ئەوی تێدایە و لەگەڵ ژیانی خۆمدا بەراوردم دەکرد، هەمدیس سەدان خەون و فانتاسیای دێرین وەئاگادەبوونەوە. زۆر جاران بەخۆم گوتووە: ئارەزوو دڵڕفێنترین و تەنیاترین شتە لە دنیادا کە دەتوانێ نەختێک ئەم ژیانە ناخۆشە ڕووناک بکاتەوە، بەڵام تێرکردنی ئەو ئارەزووە زۆر شتێکی ئەوتۆ نییە، بەپێی ئەوەی ئەو هەموو کۆنسوڵ و جێنێراڵ کۆنسوڵە چ درێخییەکیان لە تێرکردنی ئارەزوویاندا نەکردووە، کەچی ئەوە هەرگیز هیچ

ئیـرەییـیـەکی تێـدا نـەوروژاندووم. بەڵام کـاتێک پیـاوێکی وەک ئـەوەی ئەوێ دەبینم، لـە قـووڵاییـرا هـەست بە ئـیرەییـیـەکی تاڵ دەکەم. ئـەو کێـشـەیەی کـە جحێڵـیمی ژەهراوی کرد و هێشتاکەش لە ساڵانی کامـڵیدا باری شانی قورس کردووم، بۆ ئەو شتێکە لە خـۆوەڕا چارەسـەر بووە. ئەوە ڕاستـە، هەڵبـەت ئەوە بۆ زۆر کـەسی تریش هەر ئاوهـا بووە، بەڵام ئەو چارەسـەرە بـۆ کـێـشـەکـە چ ئیـرەییـیـەکم تێـدا ناوروژێنێت، بگرە قێـز، دەنا زۆر بەر لە ئێـستـا بـۆ منیش چارەسـەر دەبوو. بەڵام ئەو هـەر لـە سـەرەتـاوە خۆشـەویستیـی ژنانی بۆ بووەتە مـافێکی سروشتـی خۆی، هـەرگیز نـاچار نەبووە لە نێوان برسێتی و گۆشتـی بۆگـەنکردوودا یەکێکیـان هـەڵبژێرێت. بە ئاستـەم باوەڕیش دەکـەم کە ئەو هیچ کات فریا نەکـەوتووە کە زۆر تایبـەتی بیر بکاتەوە، هـەرگیـز کـاتی نەبووە لێ گـەڕێ پەرچەکردار ژەهر لە شـەرابەکـەیدا بچکێنێ. ئەو بەختـەوەرە و دەی من ئیرەییی پێ دەبەم.

بە لـەرزێکەوە بیـریشـم لەو، لە هـێلگا گـریگۆریۆس دەکـردەوە، لەمـیـانەی زەردەپەڕدا، نیگا لـە بەختـەوەریدا شـەڵاڵەکـەیم دەبینی. بەڵـێ، ئەو دوانە لەیەک دێن، ئەوە گوڵەوەچنییـەکی سروشتییە. گرێگۆریۆس، بۆچی دەبێ ئەو ژنە، ئەم ناوە و ئەم زەلامـە لە ژیاندا بەدوای خـۆیدا کێش بکات؟ هـەڵبـەت ئەوە شـتێکی بێ مانایە.

خـەریک بوو تـاریک دادەهـات، تیشکێکی سـوور دەکەوتە سـەر نمـای کۆشکە زەردباوە بڵـێیسـەییـیـەکـە. خـەڵکی بە شـۆستـەکـەدا تێ دەپەڕین، من گـوێم لە دەنگیـان ڕادەدێرا، یانـکی(*) گـەلی لـەڕ بە شـێـوەزارە نـاڕۆشنـەکـانیـانەوە، جوولەکەی کورتەبنە و قەڵەوی بازرگان بە دەنگی منگن و هـاوڵاتیی ئاسایی بە تۆنی خۆشحاڵانەی ئێوارەی شـەممە لە دەنگیاندا، تاک و تەرا سـەری سڵاویان بۆ دەلەقاندم و مـنیش سـەری سڵاوم بۆ دەلەقـاندنەوە، تاک و تەرا کڵاوەکـانیان هـەڵدەبڕی، منیش کـڵاوەکـەم بۆ هـەڵدەبڕینەوە. چەند نـاسـیـاوێک تـەواوێک لە نزیک مـێـزەکـەی منەوە دانیـشـتن، ئەوان مـارتین بیـرک و مـارکـێل بوون و

(*) یانکی: کەسێک خەڵکی ناوچەکانی باکوری خۆرهەڵاتی ئەمەریکا. و. کوردی

جەنابێکی تریش کە جارێک لە جاران بە دیداری گەیشتبووم، بەڵام ناوەکەیم بیرچووەتەوە یان ڕەنگە ناوەکەیم قەت نەزانیبێت – ئەو هەر زۆر کەچەڵ بوو ، کاتێکیش کە پێشتر بە دیداری گەیشتبووم، هەڵبەت لەناو خانوودا بینیبووم، بۆیە تا کڵاوەکەی بۆ سڵاوکردن لەسەری دانەگرت، نەمناسییەوە. ڕێکێ سەری سڵاوی بۆ مارتین کە دەیناسی، لەقاند، پاشان دەسبەجێ هەستا تا بڕوات. کاتێ نزیکی مێزەکەی من بووەوە، لە ناکاوێکڕا پێ دەچوو بمناسێتەوە، بۆیە زۆر بە ئەدەبانە، بەڵام نەختێک نەناسیاوانە سڵاوی کرد. لە ئۆپسالا یەکدیمان بە تۆ بانگ دەکرد، بەڵام ئەو بیری چوبووەوە.

هەر کە زانییان لە مەودایەکەوە قسەکانیان نابیسترێت، دانیشتووانی نزیکی مێزەکەم کەوتنە باسکردنی ئەو، کابرای کەچەڵ ئاوڕی بۆ مارکێل دایەوە و گوێم لێ بوو لێی پرسی:

– ئێ، ئەرێ ئەم ڕێکێیە دەناسیت، پێ دەچێ خاوەن داهاتوو بێت، دەڵێن کەسێکی بڵندڕۆیە؟

مارکێل:– بەڵێ، بڵندڕۆ... گەر بە بڵندڕۆ بانگی بکەم ئەوا زیاتر لەبەر هاوڕێیەتییە گەورەکەمانە، دەنا ڕاستترە بگوترێت کە ئەو گەرەکییەتی خۆی ڕەپێش خات. بڵندڕۆیی شتێکی دەگمەنە. ئێمە وا ڕاهاتووین بە کەسێک بڵێین بڵندڕۆ کە ئەگەر بیەوێت ببێتە وەزیر. ئەدی وەزیر چییە؟ خاوەن داهاتێکە کەمتر لە داهاتی جوملەفرۆشێک و بەحاڵ خاوەن دەسەڵاتێکی ئەوتۆیە کە بتوانێ دەسگرۆییی خزمەکانی بکات، دەسەڵاتێکی زۆر کەمتر لەوەی بتوانێت بیرۆکەکانی خۆی، گەر خاوەنی هەندێک بیرۆکە بێت، جێبەجێ بکات. بێگومان مەبەستەکە ئەوە نییە خۆم حەز ناکەم ببمە وەزیر، هەڵبەت ئەوە هەمیشە پلەوپایەیەکی لەوەی خۆم باشترە، بگرە مەبەستەکە ئەوەیە ناکرێ مرۆڤ ئەوە ناو بنێت بڵندڕۆیی. بڵندڕۆیی شتێکی ترە. لەو زەمانەدا کە من بڵندڕۆ بووم پلانێکی زۆر جوانم داڕشتبوو کە عەرد زەوت بکەم و پێوەندییەکان ڕێک بخەمەوە، بەجۆرێک هەموو شتێک بەو شێوەیە بن کە پێویستە وا بن، ئەوسا کاتێ دواجار دۆخەکە هێند باش دەبێت کە تا ڕادەیەک

بێزارکەر خۆ دەنوێنێت، ئەوسا پارەیەکی وا زۆر کە پێویستمە لەگەڵ خۆمدا دەبەم و بە ئەسپایی خۆم دەدزمەوە، لە شارێکی ملیۆن کەسیدا خۆم دەشارمەوە و لە سووچی قاوەخانەیەکدا دادەنیشم و ئابسینت(*) دەخۆمەوە و شادمان دەبم بەوەی لەگەڵ کشانەوەی مندا هەموو شتەکان چۆن بەرەو دێوانەیی ڕۆیشتوون... بەڵام بەهەرحاڵ من ئێستا "کلاس ڕێکێ"م خۆش دەوێ، لەبەرئەوەی قۆزە، لەبەرئەوەش بەهرەیەکی نائاساییی هەیە کە ئەم سەر ئەرزە پڕ لە غەم و نیگەرانییە، نەختێک بۆ خۆی میهرەبان و خۆش بکات.

ئا، مارکێل، ئەو بە گشتی وەک خۆیەتی. ئەو هەنووکە سیاسەتمەدارە لە ڕۆژنامەیەکی گەورەدا و زۆرجار خۆشمەزاجانە گوتار دەنووسێت، بەنیازی ئەوە دەیاننووسێت بە جیدی بخوێنرێنەوە و جارجاریش شایستەی خوێندنەوەن. پێش نیوەڕوان نەختێک ڕیش تەراشنەکراو و سارده، بەڵام شەوانە هەمیشە شیکە بە مەزاجێکەوە کە هاوکات لەگەڵ گڵۆپە گازییەکاندا پرشنگ دەدا. بیرک لە نزیکییەوە بە ڕوانینێکی پەرێشانەوە دانیشتووە، بەو چلەی هاوینە قاپووتێکی بارانیی گەورەی لەبەردایە و بە ژێستێکی بەستوو، لەخۆوەی دەپێچێت.

مارکێل ئاوڕی بۆ دامەوە و هاوڕێیانە لێی پرسیم کە ئاخۆ حەز دەکەم بچمە نێو پێڕێکی هەڵبژاردەی ئەلکهولیستە دێرینەکانەوە. سوپاسم کرد و وەڵامیم دایەوە کە من هەر ئێستا دەبێ بۆ ماڵەوە بڕۆمەوە. نیازیشم هەروا بوو، بەڵام لە ڕاستیدا هەستم بە هیچ تامەزرۆییەک بۆ ژووره تەنیاکەم نەبوو، قەیرێکی زیاتر دانیشتم و گوێم لەو مۆسیقایە ڕادێرا کە لە باغی "سترۆم"ەوە ئاشکرا و بەهێز لەو شەوە بێدەنگەی شارەوە دڕی بەخۆی دەدا و دەهات، بینیم کە چۆن کۆشکەکە ڕیزە پەنجەرە نابینا و چاوزەقەکانی لە زریانەکەدا

(*) absint: بادەیەکی سەوزی شیرینی خۆشائاسای لە ڕووەکی جۆراوجۆر گوشراوە، بەهۆی جۆرە ژەهرێکی عەسەبەوە کە تیایدایە، هەنووکە لە زۆربەی وڵاتاندا قەدەغە کراوە. ناوی بادەکە بە ناوی یەکێک لەو ڕووەکانەوەیە کە لێی دەگوشرێت. و. کوردی

پێــچــەوانە دەکــردەوە – لـەبەرئەوەی ئێــســتــا چ زریـانێک نەبوو، ئـاوەکـە وەک گۆمێکی دارستان بریقەی دەدایەوە. تەماشای ئەستێرەیەکی گچکەی شینم کرد کە ڕاوەستاو و بەسەر ڕۆسینباد(*) دا ورشەی دەهات. گوێم لە وتووێژی مێزەکەی تەنیشتیشم دەگرت. لەبارەی ژنان و خۆشەویستییەوە قسانیان دەکرد و پرسیارەکەش لەبارەی ئەوەوە بوو کە ئاخۆ گرنگترین مەرج چییە بۆ ئەوەی پیاوێک تەواوێک بە خۆشی لەگەڵ ژنێکدا بیباتە سەر.

پیاوە کەچەڵەکە گوتی: کە ژنەکە شازدە ساڵان بێت، کە قژی ڕەش بێت و باریکەلە بێت، کە خوێن گەرم بێت.

مارکێل بە دەربڕینێکی خەونئامێزانە گوتی: کە قەڵەو و خرپن بێت.

بیرک گوتی: کە زۆری خۆش بوێم.

(*) Rosenbad: بینایەکە لە ستۆکهۆڵم لە سترۆمگاتان. ساڵی ١٩٠٢ بەستایلی یوگیند و موتیڤی ڤێنیسیایی لەلایەن "فێردیناند بوباری" یەوە نەخشەسازی کراوە. سەرەک وەزیری سوێد و هەندێک لە وەزیرەکان لەم خانووبەرەیەدا دەوام دەکەن.

## ۲ی یولی

نا، مەسەلەکە خەریکە ناخۆش دەبێت. ئەمڕۆ لای سەعات دەی بەیانی، هەمدیس خاتوو گریگۆریۆس لە ژوورەکەمدا قووت بووەوە. ڕەنگ پەڕیو و تێکشکاو دەینواند، بە چاوانێکی زۆر زەقەوە تەماشای دەکردم. بەناچاری لێم پرسی: چ بووە؟ چییە؟ چی ڕووی داوە؟

بە دەنگێکی نزم وەڵامی دامەوە: "شەوێ بە زۆر لێم نزیک بووەوە. هێند بە زۆر وەک لاقەکردن".

لەسەر کورسیی لای مێزەکەمەوە دانیشتم، دەستم بە قەڵەمێک و کوتە کاخەزێکەوە، وەک بڵێی بمەوێت ڕەچەتەیەک بنووسم، خەریک کرد. ئەو لە سوچێکی قەنەفەکەدا دانیشت. وەک بڵێی لەگەڵ خۆمدا بدوێم، گوتم: "ئەی گچکەی داماو". ئاخر چ شتێکم نەدۆزییەوە بیڵێم.

ئەو گوتی:

– من بۆ ئەوە دروست بووم کە پێشێل بکرێم.

بۆ ساتێک بێدەنگ بووین، ئەوسا کەوتە گێڕانەوە. مێردەکەی لە نیوەشەودا بێداری کردووەتەوە. نەیتوانیوە بنوێت. کەوتووەتە سواڵ و پاڕانەوە، گریاوە. گوتوویەتی کە ڕزگاریی وی لە خەتەردایە و ئەگەر خۆی بە دەستییەوە نەدات، ئەوا نازانێ چ گوناهگەلێکی گەورەی لێ دەوەشێتەوە. گوتوویەتی ئەرکی ژنەکەیەتی ئەوە بکات، ئەرکیش پێش تەندروستی کەوتووە، بەهەرحاڵ خوا یارمەتییان دەدات، خوا تەندروستی باش دەکات.

لە واقوڕماندا لاڵ و پاڵ دانیشتبووم.

پرسیم: "کەواتە پیاوێکی کەڵەکچییە؟"

– نازانم. نا، باوەڕ ناکەم. بەڵام وا ڕاهاتووە کە بە هەموو شێوەیەک کەڵک لە خوا لەپێناو خزمەتکردنی خۆیدا وەربگرێت. ئەوانە هەمیشە وا دەکەن، هەڵبەت زۆر قەشە دەناسم. ڕقم لێیانە. بەڵام ئەو کەڵەکچی نییە، بە پێچەوانەوە، بگرە ئەو هەمیشە بەبێ چ گومانێک دیانەتەکەی خۆی پێ ڕاستترین دیانەتە، وەکی تریش پێی وایە ئەو کەسانەی ئەو دیانەتە ڕەت دەکەنەوە دەبێ خەڵکانێکی دەسبڕ و شەڕانگێز بن کە بە ئەنقەست درۆ دەکەن تا خەڵکی بەرەو خراپە ببەن.

بە هێمنی دەدوا، تەنیا لەرەیەکی گچکە لە دەنگیدا بوو، ئەوەی ئەو گوتی بە شێوەیەک لە شێوەکان سەری سوڕماندم، پێشتر نەمدەزانی کە ئەم ژنە گچکەیە پێی وایە دەتوانێ پیاوێک، پیاوێک وەک ئەوەی کە ئەو لەبارەیەوە دەدوا، ئاوها ڕۆشن و وەک بڵێی لە دەرەوەڕا هەڵسەنگێنێ، بەڵام دەبێ ئەو ژنە هەست بە ڕقێکی مرێنەر، نەفرەتێکی قووڵ بەرامبەری بکات. من هەستم بە ڕق و نەفرەت لە لەرەی دەنگی و یەک بەیەکی وشەکانیدا دەکرد. کاتێ هەموو شتەکانی گێڕانەوە، ئەو ڕق و نەفرەتە بۆ منیش دزەی کرد: ویستوویەتی هەستێ، جلەکانی لەبەرکات، بچێتە دەرەوە، بە درێژایی شەو و تا ڕۆژ دەبێتەوە لە دەرەوە بێت، بەڵام ئەو توند گرتوویەتی، ئەو بەهێز بووە، ئەو بەری نەداوە...

هەستم کرد گەرم دادێم، لاجانگەکانم زرمەیان دەهات. لە ناوەوەمڕا دەنگێکم هێند ئاشکرا دەژنەوت کە تا ڕادەیەک ترسم لێ نیشت لەوەی بە دەنگی بەرز بیرم کردبێتەوە، دەنگێک کە لە نێوان ددانەکاندا دەیچرپاند: "قەشە وریابە.. ها! من گفتم بەو ژنە داماوەی ئەوێ، بەو ژنە گوڵە پرچ زەردە ئاوریشمییە داوە کە لە تۆی بپارێزم، وریابە، ژیانت لەبەردەستی مندایە و گەر بمەوێت، دەتوانم بەرلەوەی خۆت بتەوێت و بخوازیت لێ بیتەوە و بمریت. قەشە ئاگاداربە، تۆ نامناسیت، ویژدانی من چ لێکچوونێکی گچکەی لەگەڵ ویژدانی تۆدا نییە، من دادوەری خۆم هەیە، من لە تەرزە ئینسانێکم کە تۆ پێت وانییە مابن".

ئاخۆ ئەو دانیشتبوو گوێی لە خەیاڵە نهێنییەکانم ڕادەدێرا؟ کاتێ گوێم لێی

بوو لە ناکاوێکڕا گوتی: "خۆزیا بمتوانیبا ئەو کابرایەم کوشتبا". سووکە لەرزێکی ساردم پێدا تێپەڕبوو.

بە زەردەخەنەوە وەڵامیم دایەوە: "خاتوون گریگۆریۆسی ئازیز، هەڵبەت ئەمە شێوازێکی قسەکردنە، بەڵام مرۆ نابێ تەنانەت لە دۆخێکی ئاوهادا بەکاری بێنێ".

خەریک بوو بڵێم: "لانی کەم لەم دۆخەدا".

بەڵام بەبێ ئەوەی قسەکەم ببڕم و بۆ گۆڕینی بابەتەکە گوتم: باشە هەر بە ڕاست بۆچی شووتان بە قەشە گریگۆریۆس کرد؟ ئاخۆ ئەوە لە گوشاری دایک و باوکەوە بوو یان ڕەنگ بێ لە نەختێک کاریگەریی کۆنفیرماسیۆن(*) وە بووبێت؟

جەستەی کەوتە هەڵلەرزین، وەک بڵێیت لە سەرمادا هەڵلەرزێت:

گوتی: "نەء، هیچ کام لەوانە نییە. هاوسەرگریی ئێمە بەتەرزێکی سەیر بەڕێوەچوو، شتێک نییە بتوانن مەزەندەی بکەن یان تێی بگەن. هەڵبەت من قەت ئەوم خۆش نەویستووە، تەنانەت ئەو مەیلەی کیژێکیشم نەبووە بۆ قەشەی کۆنفیرماسیۆن. هیچ کام لەوانە نا! بەڵام من هەوڵ دەدەم هەموو شتەکان بۆ ئێوە بگێڕمەوە و ڕاڤەیان بکەم".

ئەو ئیدی لە سووچی قەنەفەکەدا خۆی بزواند و گرمۆڵە وەک کچێکی گچکە دانیشت. نیگای کە بەلامدا تێ پەڕی و چووە دەرەوە بۆ نادیار، کەوتە قسان:

– من لە منداڵی و لە بەراییی گەنجیمدا زۆر بەختەوەر بووم. کاتێک بیر لەو سەردەمە دەکەمەوە وەک حیکایەتێک دێتە بەرچاوم. هەموان منیان خۆش دەویست و منیش هەموانم خۆش دەویستن و هەموانم بە میهرەبان دەزانین. پاشان ئەو تەمەنە هات، کە خۆتان دەیزانن. بەڵام لە سەرەتادا هیچ گۆڕانێکم

(*) کۆنفیرماسیۆن: بۆنەی فێرکردن و باوەڕپێهێنان بە کریستیانیزم بەر لەوەی لاوی کریستیانی بۆی هەبێت یەکەم شێوی مەسیح بخوات. شێوی مەسیحیش ئەو دوا ژەمەیە کە عیسا دوا شەوی ژیانی لەگەڵ قوتابییەکانیدا دەیخوات. و. کوردی

تێدا ڕووی نەدا، هێشتا هەر بەختەوەر بووم، بەڵێ، بەختەوەرتر لە جاران – تا تەمەنم گەیشتە بیست ساڵان. کیژێکی گەنجیش خاوەن هەوەسی خۆیەتی، هەڵبەت ئێوە لەوە تێ دەگەن، بەڵام لە بەراییی گەنجییدا تەنیا ئەو شتەیە کە بەختەوەری دەکات. لانی کەم ئەوە بۆ من ئاوها بوو. خوێن لە گوێچکەکانمدا گۆرانی دەگوت، منیش خۆم گۆرانیم دەگوت، هەمیشە هەر گۆرانیم دەگوت... کاتێک ئیشی ناومالّم دەکرد و کاتێ بە جادەکاندا دەڕۆیشتم لەبەرخۆمەوە گۆرانیم دەگوت... من هەمیشە عاشق بووم. من لە ماڵێکی زۆر ئاینیدا گەورە بووم، لەگەڵ ئەوەشدا پێم وانەبوو ماچکردن شتێکی زۆر ترسناک بێت. کاتێک عاشقی کوڕێکی گەنج بووم و ماچی کردم، من خۆم لێ گەڕام ئەوە ڕوو بدات. هەڵبەت دەشمزانی شتێکی تر هەیە کە گوناهێکی ترسناکە و مرۆڤ پێویستە خۆی لێ لا بدا، بەڵام ئەو شتەم لەلا ناڕۆشن و دوور بوو، چ وەسوەسەی نەدەکردم. نا، هەر هیچ، تەنانەت پێشم وا نەبوو ئەوە هیچ کەسێکی تریش وەسوەسە بکات، باوەڕم وابوو ئەوە شتێکە مرۆڤ دەبێ کاتێ ملی بۆ بدا کە شوو بکا و بیەوێت منداڵ بخاتەوە، بەڵام خۆی لە خۆیدا چ مانایەکی نییە. بەڵام کاتێ تەمەنم بووە بیست ساڵان زۆر عاشقی پیاوێک بووم. ئەو کەسێکی قۆز و میهرەبان بوو –لانی کەم من پێم وابوو وایە– دواتر کچێکی هاوڕێمی هێنا و گەلێک بەختەوەری کرد. هاوینێک بوو کە ئێمە لە گوند یەکترمان ناسی. یەکدیمان ماچ کرد. ڕۆژێکیان لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەوسەری دارستانەکەی بردم. لەوێ هەوڵی دا ئیغوام بکا و خەریک بوو سەرکەوێت. ئاە، گەر سەرکەوتبا، گەر من ڕام نەکردبا، ئەوا هەنووکە شتەکان جۆرێکی تر دەبوون! ڕەنگە شووم بەو کردبا، لانی کەم شووم بەمە، بەو کەسەی کە ئێستا مێردمە نەکردبا. ڕەنگە منالّی ورد و مالّم هەبان، مالّێکی واقیعی، هەرگیز پێویستی نەکردبا ژنێکی خیانەتکاربام. بەڵام من لە حەژمەت ترس و شەرم، خۆم لە ئامێزیدا ڕاپسکاند و ڕام کرد، بەرەو ژیانە سووتێنەرەکە ڕام کرد.

پاشان سەردەمێکی زۆر ناخۆش هات. نەمدەویست چی دی بیبینم، نەمدەوێرا بیبینم. ئەو گوڵی بۆ دەناردم، نامە دوای نامەی بۆ دەنووسیم و

داوای لێ دەکـردم لێی ببـوورم. بەڵام مـن پێم وابوو کـە ئەو پیـاوێکی خـراپە، وەڵامی نامـەکـانیم نـەدەدانەوە، گـوڵەکـانیـشـیـم لە پەنجـەرەکـەوە توورِ دەدانە دەرەوە. بەڵام هەمیشـە بیرم لێی دەکردەوە، هەنووکە ئیدی تەنیا بیرم لە ماچ نەدەکردەوە، هەنووکە دەمزانی وەسوەسە چییە. هەستم دەکرد گۆڕانکارییەک لە مندا ڕووی داوە، گەرچی هـیچ شـتـێکیش ڕووی نەدابوو. مـەزەندەم دەکـرد خەڵکی دەتوانن ئەو گۆڕانەم تێدا ببینن. کەس ناتوانێ تێ بگا کە چ عەزابێکم دەکێشـا. پایز کاتێ بۆ شـار گواسـتمـانەوە، خـۆرنشـینێک چووبوومـە دەرەوە و بە تەنیـا دەڕۆیشـتم. با بە دەوری سـووچی خـانووەکاندا دەیگڤاند و جـاروبار نمەبـارانێک دەباری. چـوومـە ئەو جـادەیەی کـە دەمـزانی لـەوێ دەژی، بەلای ماڵەکەیدا تێ پەڕیم. ڕاوەستام و بینیم پەنجەرەکەی ڕووناکە، لەبەر ڕۆشنایی لەمـپـاکـەدا سـەریم بینی کـە بەسـەر کـتـێـبـێکدا شـۆڕی کـردبووەوە. وەک مـوگناتیس بۆ لای کـێش بووم، پێم وابوو کـە چەند خـۆش دەبوو لەوێ، لەلای بام. بە دەروازەکـەدا دزەم کـردە ژوورێ و نیـوەی پێـپلیکانەکـانم بڕی، ئیـدی لەوێوە گەڕامەوە.

گەر لەو ڕۆژانەدا نامـەی بۆ نووسیبام، وەڵامیم دەدایەوە. بەڵام ئەو ئیدی لە نووسـینی نامـەی بێ وەڵام مـاندوو بووبوو ، پاشـان هەرگیـز بۆ سـاڵانێکی زۆر یەکتـرمـان نەبینییـەوە، کـاتێک یەکتـرمـان بینیـیـەوە ئیـدی هەمـوو شـتـەکـان جۆرێکی تر بوون.

هەڵبـەت تازەکی پێم گوتن کـە من پەروەردەکردنێکی ئاینیی پتـەوم هـەبووە. هەنووکـە تەواوێک لـە ئایندا غـەرق بووبووم، بوومـە قـوتـابی پەرسـتیـاری، بەڵام دەبوو وازی لـێ بێنم، چـونکە تەندروسـتـیم خـراپ بوو، هەمـدیس بۆ مـاڵەوە گەڕامـەوە و وەک جاران خـەریکی کاروباری مـاڵ بوومـەوە و کـەوتمەوە خـەون بینین و پەرۆش بوون و لـە خـواپاڕامـەوە لە خـەون و لە پەرۆشـییـەکانم ڕزگـارم بکات. هەستم دەکرد ئەوە شـتێکە بەرگە ناگیرێ و پێویسـتـە شتێک ڕوو بدات. ئەوسا لە باوکمەوە زانیم کە قـەشـە گریگۆریۆس خـوازبێنیی کردووم. تەواوێک واقم وڕما، ئاخر ئەو قەت بە شێوەیەک لە شـێوەکان لێم نزیک نەکەوتبووەوە تا

سووسەی شتێکی لەو جۆرە بکەم. ئەو دەمێک بوو هامشۆی ئێمەی دەکرد، پێم وایە دایکم پەسەنی دەدا و باوکیشم نەختێک لێی دەترسا. چوومە ژوورەکەم و گریام. هەمیشە شتێک لەودا هەبوو کە بە شێوەیەکی تایبەتی بێ مەیلیی تێدا دەوروژاندم و پێم وایە ڕێک ئەو شتە بووە هۆی ئەوەی کە دواجار بڕیار بدەم پێی قایل بم. کەس زۆری لێ نەکردم، کەس هەوڵی بۆ قایلکردنم نەدا. بگرە پێم وابوو ئەوە خواستی خوایە. ئاخر فێرکرابووم باوەڕبێنم بەوەی کە خواستی خوا هەمیشە بە زۆری پێچەوانەی خواستی ئێمەیە. شەوی پێشتریش نەنووستبووم و لە خوا داوای ڕزگاری و ئاسوودەییم کردبوو. پێم وابوو خوا بە شێوازی خۆی گوێی لە پاڕانەوەکانم بووە. پێم وابوو خواستی خوا زۆر بە ڕۆشنی لە بەرامبەر چاوانمدا دەبینم. پێم وابوو لەپاڵ ئەو پیاوەدا پەرۆشیم دادەمرکێتەوە و حەز و ئارەزووم دەمرێ، ئیدی بەو شێوازە ئەوەی بۆ ڕێک خستبووم، هەروا لەبەرئەوەی قەشەش بوو، من دڵنیابووم پیاوێکی باش و میهرەبانە.

هەڵبەت شتەکان بە شێوەیەکی جیاواز کەوتنەوە. ئەو خەونەکانمی نەکوشت، بگرە تەنیا توانی پیسیان بکات. لەبری ئەوە وردە وردە باوەڕی کوشتم، ئەوە تەنیا شتێکە کە من بەهۆیەوە سوپاسگوزاریم، چونکە پەرۆش نیم بۆی بگەڕێمەوە. کاتێ ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە، تەنیا وەک شتێکی سەیر دێتە بەرچاوم. هەموو شتێک کە بنیادەم پەرۆشی بێت، هەموو شتێک کە بیرکردنەوە لێیان خۆش بێت، گوناهن. لەئامێزگرتنێکی پیاو گوناهە، گەر مرۆڤ تامەزرۆی بێت و ئارەزووی بکات، بەڵام ئەگەر بنیادەم ئەوە دزێو و بێ تام، وەک بەڵایەک و عەزابێک و دڵ تێکهێنێک ببینێت، ئەوسا گوناهە ئارەزووی نەکەیت! دوکتۆر گلاس بڵێ، ئاخر ئەمە سەیر نییە؟

ئەو گەرم و گوڕ دەدوا. بە ژوور چاویلکەکەمەوە سەرم بۆ لەقاند.

– با، هەڵبەتە سەیرە.

– یان بڵێ، پێتان وایە ئەڤینەکەی ئێستام گوناە بێ؟ ئەمە تەنێ بەختەوەری

نییه، ڕەنگە زیاتر پەژارە بێت، بەڵام پێتان وایە گوناه بێ؟ گەر گوناه بێ ئەوا هەموو شتێکم گوناهە، لەبەرئەوەی ناتوانم هیچ شتێک لای خۆم ببینمەوە لەوە باشتر و بەنرختر بێت... بەڵام دەشێ پێتان سەیر بێت کە لێرەدا دانیشتووم و لەبارەی ئەوەوە لە تەکتاندا دەدوێم. خۆ من کەسێکی ترم هەیە قسانی لە تەکدا بکەم، بەڵام کاتێک یەکدی دەبینین زەمەن زۆر کورتە و ئەویش زۆر کەم قسەم لەگەڵ دەکات – کتوپڕ سوور هەڵگەڕا– زۆر کەم لەبارەی ئەو شتەوە قسەم لەگەڵ دەکات کە من زۆر بیری لێ دەکەمەوە.

من دەستم نابووە ژێر چەناگەم و ئارام و بێدەنگ دانیشتبووم، بە چاوانێکی نیوەداخراو تەماشایم دەکرد، بە ڕەنگی گوڵ سوورهەڵگەڕاو و بە پرچە زەردە پڕەکەیەوە لەوێ لە سووچی قەنەفەکەدا دانیشتبوو. پاقیژەی گۆنا مەخمەڵی. لە فیکرەوە چووم: گەر ئێستا هەمان ئەو هەستەی بەرامبەر من هەبوایە، ئەوا زەمەن بەشی قسەکردنی نەدەکرد، کاتێ پاشان –وام بەخەیاڵدا هات– دەست دەکاتەوە بە قسان، ئەوا لێی دەچمە پێشێ و بە ماچێک زاری لێک دەنێم. بەڵام ئێستا ئەو بێدەنگ دانیشتبوو، دەرگاکە لەسەر ژووری گەورەی چاوەڕوانی تا نیوە کرابووەوە، تەپەی پێی ژنە فەڕاشەکەم لە ڕاڕەوەکە دەژنەوت.

بێدەنگییەکەم شکاند:

– بەڵام خاتوو گریگۆریۆس پێم بڵێ ئایا ئێوە قەت بیرتان لە جیابوونەوە نەکردووەتەوە؟ خۆ ئێوە بە هیچ زۆرەملێیەکی ئابوورییەوە بە مێردەکەتانەوە نەبەستراونەتەوە، هەڵبەت باوکتان لەدوای خۆی سەروەت و سامانی بۆ جێ هێشتوون، ئێوەیش تاقانەن، دایکیشتان هێشتا لە ژیاندا و لە بارودۆخێکی باشدایە، راستە؟

– ئاخ دوکتۆر گلاس، ئێوە نایناسن. جیابوونەوە؟ لە قەشەیەک! هەرچییەک بکەم و هەرچییەک ڕووبدات ئەو هەرگیز مل بۆ ئەوە نادات، هەرگیز. ئەو بە خۆشحاڵییەوە هەزار کەڕەت دەمبوورێ، ئاشتم دەکاتەوە و هەموو شتێکی

تر... له توانایدا هەیە کە بۆ بەختەوەریی من لە کڵێسا لە خوا بپاڕێتەوە. نا، من بۆ ئەوە دروست بووم کە پێشێل بکرێم.

هەستام:

– بەڵێ، خانم گریگۆریۆسی ئازیز، ئێستا ئێوە دەتانەوێت چۆن بکەم؟ من هەنووکە چ ڕێگەچارەیەکی تر شک نابەم.

دوودڵانە سەری بادا.

– نازانم. ئیتر هیچ نازانم. بەڵام پێم وایە ئەمڕۆ بۆ نەخۆشیی دڵەکەی دێت بۆ لاتان، ئەو دوێنێ لەوبارەیەوە قسەی کرد. ئاخۆ ناکرێ جارێکی تریش لەگەڵیدا بدوێن؟ هەڵبەت بەبێ ئەوەی سووسەی ئەوە بکات کە من ئەمڕۆ لێرە بووم و لەوبارەیەوە لەگەڵتان دوواوم؟

– بەڵێ، با بزانین.

ئەو ڕۆیشت.

کاتێ ڕۆیشت، دەستم دایە ڕۆژنامەیەکی ساندیکای پزیشکان تا دڵی خۆم بدەمەوە، بەڵام کەڵکی نەبوو، بەردەوام لەبەرچاوانمدا دەمبینی، دەمبینی لەوێ لە سووچی قەنەفەکەدا هەڵترشکاوە و لەبارەی چارەنووسی خۆیەوە قسان دەکات، کە چۆن بووە ئاوها کەوتووەتە ئەم لێوارە تەواو چەوتەی دنیاوە، ئاخۆ هەڵەی کێ بووە؟ هەڵەی ئەو پیاوە بووە کە لە ڕۆژێکی هاویندا لە دارستانەکەدا ئیغوای کردووە؟ ئاخ، مەگەر ئەرکی قەدبڕی پیاو بەرامبەر بە ئافرەت چ شتێکی تر نییە جگە لە ئیغواکردنی، جا با ئەوە لە دارستاندا ڕوویدات یان لەسەر سیسەمی بووک، پاشانیش یارمەتیی بدا و پشتی بگرێ لە هەموو ئەو شتانەدا کە لە ئیغواکردنەکە دەکەونەوە. ئەدی هەڵەی کێ بووە؟ هەڵەی قەشە بووە؟ هەڵبەت ئەو تەنیا ئارەزووی لێی بووە وەک دەیان هەزار پیاوی تر کە ئارەزوویان لە دەیان هەزار ژنە، وەک ئەوەی لە زبانە سەیرەکەی خۆیاندا پێی دەگوترێت ئارەزووی کردووە لە مامەڵەیەکی پرەنسیپیی جڵەودارئامێز و شەرافەتمەندانەدا، ژنەکەیش بەبێ ئەوەی بزانێت یان تێ

بگات و تەنیا لە نائومێدی و لەژێر کاریگەریی تێکەڵبوونی چەمکەکاندا کە ئەوی تێدا گەورە بووە، قایل بووە. ئەو کاتێ شووی بەو پیاوە کردووە بێدار نەبووە، بگرە لە خەودا شووی پێ کردووە. هەڵبەت لە خەوندا سەیروسەمەرەترین شت ڕوودەدەن کە تەواو و سروشتی و ئاسایی وەدیاردەکەون، بەڵام کاتێ بنیادەم بێدار دەبێتەوە و ئەو شتە وەبیری خۆی دێنێتەوە کە لە خەوندا بینیویەتی، ئەوا سەری سووڕدەمێنێ ، یان قاقا پێ دەکەنێ یاخۆ دەکەوێتە هەڵلەرزین. دەی ئێستا ئەو بێداربووەتەوە! دایک و باوکیش کە دەبێ بزانن هاوسەرگری چییە، کەچی پێی قایل بوون و ڕەنگ بێ تەنانەت خۆشحاڵیش بووبن و هەستیان کردبێ ستایش کراون، ئایا ئەوانیش بێداربوونەتەوە؟ ئەدی قەشە خۆی، کەمترین هەستی بۆ ئەو شتە ناسروشتی و زۆر بێ ئابڕووانەیەی کارەکەی هەیە؟

هەرگیز هەستێکی ئاوها بەهێزم نەبووە بەوەی کە مۆراڵ کورسی کورسییەکە و دەسووڕێتەوە. لە ڕاستیدا پێشتر ئەوەم دەزانی، بەڵام هەمیشە پێم وابووە ساتەکانی وەرچەرخان دەبێ سەدە و سەردەم بخایەنن، بەڵام هەنووکە وەک دەقیقە و چرکە دێنە بەرچاوم. شتێک لەبەر چاوانمدا دەدرەوشێتەوە، لەم سەرەداوەی میانەی سەمای جادووەکەدا هەمدیس جارێکی تر دەنگەکە لە ناوەوەمڕا دەزرنگێتەوە، دەنگێک کە بە ددان جیڕکردنەوەوە دەڵێت: ها قەشە، وریابە!

**

ڕێک وابوو. قەشە گریگۆریۆس لە وادەی سەردانی نەخۆشەکاندا هات. کاتێ دەرگاکەم کردەوە و ئەوم بینی لە دەرەوە لە ژووری چاوەڕوانی دانیشتووە، شادمانییەکی ناکاو و شاراوە دای گرتم. تەنیا نەخۆشێکی لە پێشەوە بوو، پیرێژنێک کە دەیویست ڕەچەتەیەکی بۆ نوێ بکەمەوە، ئیدی ئەوسا نۆرەی ئەو بوو. کلکی پاڵتۆکەی کردبووەوە و بە شکۆیەکی ئارامەوە لە سووچی هەمان ئەو قەنەفەیەدا دانیشت، کە چەند سەعاتێک لەوەوبەر ژنەکەی لەسەری کروشکەی کردبوو.

هەڵبەت وەک جاران قسەکانی بە کۆمەڵێک شتی تووڕەهات دەست پێ کرد. بە مەسەلەی شامی عیساییەوە سەرگەرمی کردم. نەخۆشی دڵەکەی وەک مەسەلەیەکی لامسەرلایی، وەک ڕستەیەکی گوزارەیی باس کرد، ئەو هەستەم لەلا دروست بوو کە لە ڕاستیدا ئەو هاتووە وەک پزیشکێک ڕام دەربارەی مەترسییە تەندروستییەکانی شامی پیرۆزی عیسایی بزانێت کە ئەم ڕۆژانە بە نۆرە لەگەڵ باسکردنی ستورخیۆیویوریت(*) دا بووەتە دێباتی هەموو ڕۆژنامەکان. من بەدوای ئەو وتووێژانەدا نەچووبووم ، ئەوە نەبێ کە جار ناجار گوتارێکم لەو بارەیەوە لە ڕۆژنامەیەکدا بینیوە و تا نیوەیم خوێندووەتەوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک ئاشنای بابەتەکە نەبووم، لەبری ئەوە قەشە ڕەوشی بابەتەکەی بۆ ڕوون دەکردمەوە. مرۆڤ چ بکات بۆ ئەوەی نەگوێزانەوەی پەتا لە کۆمیونەکاندا ڕۆبنرێت. ئەمە پرسیارەکە بوو. قەشە زۆر بە داخەوە بوو کە پرسیارێکی لەو جۆرە وروژێنراوە، بەڵام هەنووکە کە وروژێنراوە، دەبێ وەڵام بدرێتەوە. مرۆڤ دەتوانێ بیر لە ژمارەیەکی بێ ئەژمار ڕێگەچارە بۆ پرسەکە بکاتەوە. ڕەنگە ساکارترینیان ئەوەبێ کە هەموو کڵێسایەک ژمارەیەک جامی گچکە دابین بکات کە دوای هەر جارێک لای ئەڵتارەکەوە لەلایەن ناقوسەوانەکەوە پاک بکرێنەوە – بەڵام ڕەنگە ئەمە گران بکەوێت و هەتا ڕەنگە بۆ کڵێسا هەژارەکانی گوندەکان زەحمەت بێت ژمارەیەک جامی زیوینی پێویست دابین بکەن.

من بە لامسەرلایی سەرنجم دا لەم زەمانەی ئێمەدا، کە گرینگی پێدانی ئاینی لە پەرەسەندنێکی بەردەوامدایە، ژمارەیەک جامی زیوینی زۆر بۆ پێشبڕکێی پاسکیل سواری دابین دەکرێت، ئەوا هەڵبەت زەحمەت نییە تەواوێک هەمان ژمارە جامی لەو شێوەیە بۆ مەبەستێکی ئاینی دابین بکرێت. وێڕای ئەوەش بیرم ناکەوێتەوە کە لە کتێبی پیرۆزدا بۆ شامی عیسایی بە یەک تاقە وشە باسی زیو کرابێت، بەڵام ئەو ڕا بەیانکردنەم لای خۆم

(*) Storsjöodjuret: زەریاچەیەکە لە ناوچەی یامتلاندی سوێد و پێنجەم گەورەترین زەریاچەی ئەو وڵاتەیە. و. کوردی

هێشتەوە و باسم نەکرد. قەشە درێژەی دایێ: هەروەها دەکرێ بیر لە رێگەچارەی تریش بکرێتەوە بەوەی کە هەر میوانێکی شامی عیسایی جام یان پەرداخی خۆی لەگەڵ خۆیدا بهێنێ، بەڵام ئەوە چۆن دەکەوێتەوە کاتێ دەوڵەمەندەکان بە جامی زیوینی بە شێوەیەکی هونەرییانە نەخشێنراوەوە بێن و هەژارانیش ڕەنگە پەرداخی شەراب خواردنەوە لەگەڵ خۆیاندا بهێنن؟

بەشبەحاڵی خۆم ئەوە دەکرێ وەک دیمەنێکی تا ڕادەیەک تابلۆیی وەدیار بکەوێت، بەڵام بێدەنگ بووم و لێ گەڕام ئەو لە قسەکانی بەردەوام بێت. – زیاتریش لەوە قەشەیەکی مۆدێرن و لیبراڵ پێشنیاری کردووە کە خوێنی ڕزگارکەرەکەی ئێمە بکرێتە کەپسوولەوە–. یەکەمجار بیرم کردەوە بڵێی ڕاست لە قسەکەی حاڵی بووبم، لە کەپسوولدا، وەک ڕۆن گەرچەک؟– بەڵێ، بە کورتی و کرمانجی لە کەپسوولدا. دواجاریش ئوسقوفێک تەرزێک بۆرەکی تەواوێک نوێی شامی عیسایی داهێناوە و ڕەزامەندی بۆ داهێنانەکەی وەرگرتووە و کۆمپانیایەکی سەهمداری بۆ رۆناوە– قەشە بە دورودرێژی باسی ئەو داهێنراوەی بۆ کردم، پێ دەچوو نزیکەی لەسەر هەمان بیرۆکەی پەرداخ و بوتڵی پرۆفیسۆرە سیحربازەکان ڕۆنرابێت. – باشە، خۆ قەشە گریگۆریۆس بەشبەحاڵی خۆی ئەرتەدۆکسە و فرِی بەسەر لیبراڵییەتەوە نییە، لەبەرئەوە ئەم هەواڵانە پێکڕا دووچاری نیگەرانییەکی زۆری دەکەن، بەڵام خۆ بەکتریاکانیش نیگەرانکەرن، ئیدی بنیادەم چ بکات؟

بەکتریاکان– هەر کە ئەو وشەیەی گۆکرد، تروسکاییەک لە ناوەوەمرِا پرشنگی دا. تەواوێک ئاشکرا تۆنی گۆکردنەکەیم ناسییەوە، بیرم کەوتەوە پێشتر جارێک لە جاران گوێم لێی بووە باسی بەکتریای کردووە، ئیدی لەناکاوێکرِا بۆم ئاشکرا بوو کە ئەو دووچاری نەخۆشییەکە، پێی دەگوترێت بەکتریا فۆبیا. ئاشکرایە بەکتریا بە شێوەیەکی نهێنی ئامێز لەبەر چاوانیدا لەدەرەوەی هەر یەک لە ئاین و ڕێسای بە حەیای دنیادا بوون. ئەمەش لەبەرئەوە بوو کە ئەوانە زۆر نوێ بوون. ئاینەکەی ئەو کۆن بوو، نزیکەی هەزار و نۆ سەد ساڵ، ڕێسای بەحەیای دنیایەش لانی کەم لە سەرەتای سەدەوە، لە

فەلسەفەی ئەڵمانی و کەوتنی ناپلیۆنەوە مێژووی خۆی دیاری کردبوو. بەڵام بەکتریاکان لە تافی پیریدا شالاویان بۆ هێنابوو، تەواوێک خافڵگیرانەش. لە مەزەندەی ئەودا بەکتریاکان لەم دوادواییانەدا چالاکییە دڵنەخوازەکانیان دەس پێ کردووە و هەرگیز بە خەیاڵیدا نەهاتووە کە بەپێی هەڵسەنگاندن لەوەی کە ڕووی داوە بەکتریاگەلێکی زۆر لەو جەڕە گلێنەشدا هەن کە لە گێتسێمانێ[*] بە دەوری مێزەکە و لە ژەمی ماڵئاواییدا دەستاودەست دەکەن.

زەحمەت بوو بڕیار بدرێ کە ئاخۆ قەشە زیاتر مەڕە یان ڕێوی.

پشتم تێ کرد و لێ گەڕام بدوێ، لەکاتێکدا من لە دۆلابی کەلوپەلەکانمدا شتێکم ڕێک دەخست. لامسەرلایی داوام لێ کرد پاڵتۆ و هێلەکەکەی داکەنێ، ئەوەی پێوەست بە پرسی شامی عیساییشەوە بوو، بەبێ تێفکرینێکی زۆر، بڕیارم دا دەسپێکی خۆم بۆ میتۆدی کەپسوولەکە بخەمە ڕوو:

گوتم: قەبووڵمە ئەو بیرۆکەیە لە یەکەمین بینینەوە تەنانەت بۆ منیش کە ناتوانم لافی ئەوە لێ بدەم هیچ پێوەندییەکی تایبەتی و گەرمم بە ئاینەوە هەیە، کەمێک نارەحەتکەر خۆ بنوێنێ. بەڵام دوای بیر لێکردنەوەیەکی باش هەموو دوودڵییەکان هەرەس دێنن. هەڵبەت جەوهەرەکە لە شامی عیساییدا نەنانە و نەشەراب و نەزیوی کلێساشە، بگرە ئیمانە، ئەو ئیمانە ڕاستەقینەیەش نابێ بهێڵرێ بکەوێتە ژێر کاریگەریی شتگەلێکی ڕووکەشی وەک کاسەی زیو و کەپوسولی جەلاتینەوە.

لەمیانەی دواین وشەکاندا، گۆیشی دکتۆرییەکەم نایە سەر سینگی و داوام لێ کرد نەختێک بێدەنگ بێت و ئیدی گوێم ڕادێرا. چ شتێکی ئەوتۆم گوێ لێ نەبوو، تەنیا ئەو لێدانە گچکە نارێکوپێکە نەبێ لە جووڵەی دڵدا کە شتێکی

---

[*] Getsemane: باغێک لە چیای زەیتوون کە تیایدا مەسیح دوای شامی عیسایی لەلایەن یەهودای ئەسخریۆتییەوە خیانەتی لێ دەکرێ و دەگیرێت. چاوی فرانسیسکۆنییەکان تا ئێستاش باغێک لە داوێنی چیای زەیتووندا دەبینن، کە وەک گێتسێمانێ خۆدەنوێنێ. و. کوردی

زۆر ئاسـاییـیـە لای پیـاوێکی پیـر بەوەی ڕاهـاتووە زیـاد لە پێداویسـتی خـۆی زیادەخـۆری لە فـراویندا بکا و پاشـان خـۆی لەسـەر قـەنەفـە لوول بـدا و لێی بنوێ. هەڵبەت بۆی هەیە ئەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان سەکتەیەکی دڵی لێ بکەوێتەوە، بنیادەم چوزانێ، بەڵام ئەوە شـتێکی حەتمی یان تەنانـەت شیاوی ئەوە نییـە کە چ مەترسییەکی دیاریکراوی هەبێت.

بەڵام من بڕیارم دابوو بەردەوام بم لەوەی بـاسـێکی جـیـدی لەم مـشـاوەرە پزیشکییە دروست بکەم. زۆر زیاتر لەوەی کە لە ڕاستیدا پێویستم بوو. گوێم ڕادەدێرا، گـۆیشـیـیـەکـەم جـێگۆڕکـێ پێ دەکـرد، لـە سـینـگیم دەدا و گـوێم ڕادەدێرایەوە. سەرنجم دا کە چەند مایەی ئازارە بۆی لە تـەواوی ئەو ماوەیەدا بێدەنگ و تەوەزەل دانیشێ. ئاخر ئەو وا ڕاهـاتبوو بەردەوام بدوێت، لە کڵێسا، لەگەڵ خـەڵکی و لە ماڵەکەی، ئەو خـاوەن بەهرەیەکی دیار بوو لەوەدا کە بدوێ، پێش دەچێ ڕێک ئـەو بەهرە بچکۆلەیەی بێ کە یەکـەم جـار بەلای پیشـەکـەیدا بردبێ. پشکنینەکەم کەمێک ترسـاندبووی، ڕەنگبێ پێی خـۆشـبووبێ سـاتێکی تر لەبارەی بەکـتریاکانی شـامی عیسـاییـیـەوە بدوێ تا پاشـان لە نـاکاوێکرا تەماشای کاتژمێر بکا و بەرەو دەرگاکە بکەوێتە خۆ. بەڵام ئێستا لە سووچی قـەنەفـەکەدا بەگیـرم هێناوە و بەرم نەدەدا. گوێم ڕادەدێرا و بـێدەنگ دەبووم. چەندێک زیاتر گوێم ڕادێرابا، ئەو دڵی گرفتارئامێزتر دەبوو.

دواجار پرسی: خەتەرە؟

دەسـبـەجـێ وەڵامـیم نەدایەوە. چەند هـەنگاوێک بەسـەر ئەرزەکـەدا ڕۆیشـتم. پلانێک هەبوو خەریک بوو لە ناوەوەمڕا دروست دەبوو. خۆی لە خۆیدا پلانێکی زۆر ساکار و گچکە بوو، بەڵام چونکە بە دەسـیسـەچنی ڕانەهاتووم، لەبەرئەوە دوودڵ بووم. هـەروەهـا لەبەرئەوەش دوودڵ بـووم چونکە پـلانەکـە لە بنـاخـەوەڕا لەسـەر گێلێتی و نـەزانیی ئەو ڕۆنرابوو – ئایا ئەو هـەر بە ڕاسـتیی گێل بوو، ئاخـۆ زاتم کـردبا؟ یان بڵـێی پلانەکـەم زۆر توندوتـۆڵ بێت، بڵـێی دەسـتـەکـەم نەکەوتبایە ڕوو؟

له هاتوچوونەکەم ڕاوەستام و بە هەرە بڕندەترین نیگای پزیشکانەم بۆ دوو چرکە تەماشایم کرد. ڕووخسارە ڕەنگ خۆڵەمێشییە پەڕیو و قەڵەوە شەپڕێوەکەی چرچ و لۆچییەکی مەڕئاسای بەخۆوە گرت، بەڵام نیگای نەیتوانی بمبینێت، چاویلکەکەی تەنیا پەنجەرەکەمی بە پەردەکان و فیکۆس(*)ەکەی سەر تاقەکەیەوە پێچەوانە دەکردەوە. بەڵام من بڕیارم دا زات بکەم. لە فیکرەوە چووم ڕێوی بێت یان مەڕ، خۆ هەڵبەت ڕێویش هەمیشە لە مرۆڤ دەبەنگترە. مرۆڤ دەتوانێ بۆ ساتێک بەبێ ڕیسک کەڵەکبازیی لەگەڵدا بکات – ئەو بۆ خۆیشی حەزی لە کەڵەکبازیەتی بوو، بە ئاشکرا دیاربوو، پیاسە ڕامان ئامێزەکەم بە ژوورەکەدا و بێدەنگییە درێژەکەم بەدوای پرسیارەکەیدا، کاری تێ کردووە و نەرمی کردووە.

دواجار بە چرپە، وەک ئەوەی بۆ خۆم بدوێم گوتم: سەیرە.

وام گوت و سەرلەنوێ بە گۆیشییەکەوە خۆم لێ نزیک کردەوە. درێژەم دایێ:

– ببوورە، من هێشتا دەبێ نەختێکی تر گوێ بگرم تا دڵنیابم ناکەومە هەڵەوە.

دواجار گوتم: "بەڵێ، بە گوێرەی ئەوەی ئەمڕۆ گوێم لێ بوو، دەبێ ئەوە بڵێم کە قەشە خاوەن چ دڵێکی تەندروست نین. بەڵام پێم وانییە لە ژیانی ڕۆژانەدا بەو خراپییە بێت. پێم وایە هۆی تایبەتی هەیە کە ئەمڕۆ ئاوها خراپ لێ دەدا!"

هەوڵی دا بە پەلە ڕوخساری پرسیارئامێز لێ بکات، بەڵام بە تەواوی نەیتوانی ئەوە بکات. دەسبەجێ بینیم کە ویژدانە داتەپیوەکەی لێم حاڵی بووە. زاری بۆ دەس پێکردن بۆ قسە جووڵاند، ڕەنگ بێ بۆ ئەوەی بپرسێ مەبەستم چییە، بەڵام نەیتوانی، لەبری ئەوە تەنیا کۆکی. هەڵبەت دەیویست خۆی لە کۆڵ ڕاڤەیەکی وردی من بکاتەوە – بەڵام من ئەوەم نەدەویست. گوتم:

– قەشە گریگۆریۆس، لێ گەڕێ با ڕاشکاوانە لەگەڵ یەکدیدا بدوێین – بە

(*) Fikus جۆرە گیایەکی ناو ماڵە. و. کوردی

بیستنی ئەم پێشـەکییـەی من ڕاچڵەکی- قـەشـە بە دڵنیـاییـیـەوە ئەو وتووێژەی نێوانمانی بیرنەچووەتەوە کە دوو هەفتەیەک لەمەوبەر کردمان لەبارەی ڕەوشی تەندروستیی خـاتوونەکـەتانەوە. من نامـەوێ چ پرسـیارێکی پەیجـۆرییـانە بکەم لەبارەی ئەوەی کە قەشە تا چەند پابەند بووە بە بەڵێنەکەی نێوانمانەوە، بەڵام تەنیا دەمەوێ بڵێم گەر ئەوسا بمزانیبا دڵتان لە چ دۆخێکدایە، ئەوا بەڵگەی بەهـێـزتـرم بۆ ئەو ئـامـۆژگـارییــە بـۆ دەهێنانـەوە، کـە مـۆڵـەتم بە خــۆم دابوو عەرزتانی بکەم. سـەبارەت بە خـاتوونەکـەتان مـەسـەلەی تەندروسـتـیـیـەکـەی بۆ کـاتێکی درێژ یان کـورتتـر لەمـیـانـدایە، بەڵام بۆ قــەشــە خـۆی هـەر زۆر بە سادەیی، ژیانتان لە مەترسیدایە.

کـاتێ قسـەم دەکرد ترسناک دەینواند، ڕوخساری جۆرە ڕەنگێکی بەخۆوە گرت، بەڵام هیچ سـوورێک نا، بگرە تەنیا سـەوز و ڕەنگێکی لەنێوان سـوور و شیندا. هێند ترسناکانە ناشیرین بووبوو کە نەدەکرا تەماشای بکرێت. ناچار بووم دوور بکەومــەوە. بەرەو لای پەنجـەرە کراوەکـە چووم تا نـەختـێک هـەوای پاک هەڵمـژمـە سـییـەکانمەوە، بـەڵام هـەواکـەی دەرەوە لەوەی ناوەوە خنکاوتر بوو.

درێژەم دایێ:

- ڕەچەتەکــەی من ســاکـار و ئاشکرایە: ژووری جـیــای نووستن. لەیادمـە قەشە گوتی حەزی بەوە نییە، بەڵام ئەوە ناخوات، لەبـەرئەوەی کە هـەر بە تەنیا ڕەحـەتبـوونە گەورەکە خـۆی لە ڕەوشـێکی ئاوهـادا بۆ ئێـوە خـەتەر نییـە، بگرە دەبێ خـۆتان لە هـەمـوو ئەو شـتـانەش بپـارێزن کـە دەتانبـزوێنێ و مـەیلتـان دەوروژێنێت. بەڵێ، بەڵێ دەزانم قـەشـە دەیەوێ بڵـێ چی، دەیەوێ بڵـێ پیـاوێکی پیـرن، وێڕای ئەوەش قـەشـەن، بەڵام خـۆ منیش پزیشکم و مـافی ئـەوەم هـەیە ڕاشکاوانە لەگەڵ نەخۆشەکانمدا بدوێم. پێم وانییە زۆر پەیجۆر بم گەر ئاماژە بەوە بدەم کـە نزیکبـوونەوەی بەردەوام لە ژنێکی گـەنج، بەتایبـەتیش لە شـەودا، نزیکەی هـەمان کاریگەریی لەسـەر قەشـەیەک هـەیە وەک لەسـەر هـەر پیاوێکی تر هـەیەتی. خۆ من لە ئۆپسـالا خوێندوومـە و لەوێڕا زۆر قوتابی تیۆلۆگم ناسـیون

و بە هەستێکی ئاوها نەگەیشتووم کە خوێندنی تیۆلۆگی بۆ ئەو جەستە جحێڵانەی کە بەم چەشنە بڵێسەی ئاگرە دەسووتێن، دڵنیاییان لە نەسووتان لە خەڵکانی تر زیاتر بۆ دابین بکات. ئەوەی کە پێوەستیشە بە تەمەنەوە – ئا، قەشە تەمەنتان چەندە؟– پەنجا و حەوت ساڵ، ئەوە تەمەنێکی قەیراناوییە. لەو تەمەنەدا حەز و مەیل نزیکەی بە هەمان شێوەیە کە پێشتر هەبووە – بەڵام ڕەحەت بوون تۆڵە دەکاتەوە. باشە، ئەوە ڕاستە کە شێوازی جۆراوجۆر بۆ ڕوانینە ژیان و شێوازی جۆراوجۆریش بۆ نرخاندنی هەیە. ئەگەر ئێستا لەگەڵ پیرەمێردێکی کەیفسازدا دوابام، بێگومان خۆم ئامادە کردبوو لە گۆشەنیگای ئەوەوە گوێم لەم وەڵامە تا ڕادەیەک لۆگیکییە بێت: گووی تێکە، چ مانای نییە درێخی لە شتێک بکرێت کە نرخ دەداتە ژیان تەنیا لەبەرئەوەی پارێزگاری بە ژیانەوە بکرێت. بەڵام خۆ دەشزانم ئەم جۆرە شێوازە بۆ دەلیل هێنانەوە تەواوێک بە ڕوانینی قەشە بۆ بینینی دنیا بێگانەیە. ئەرکی من وەک دوکتۆرێک لەم دۆخەدا ڕاڤەکردن و ئاگادارکردنەوەیە، ئەمە هەموو ئەو شتەیە کە دەتوانم بیکەم، ئێستاش دڵنیام قەشە دەزانێ ئەم مەسەلەیە جیدییە و ئەوە هەموو ئەو شتەیە کە پێویستە. بۆ من قورسە مەزەندە بکەم قەشە پێی خۆشە بە هەمان شێوەی خوالێخۆشبوو شا فریدریکی یەکەم یان ئەم جەنابەی دوایی فێلیکس فاورێ، لار بێتەوە و بمرێت...

کاتێ دەدوام خۆم لە نیگاکانی دەپاراست، بەڵام کاتێ لە قسەکانم بوومەوە، بینیم دانیشتووە و دەستی ناوەتە سەر چاوی و لێو دەجووڵێنێ، زیاتر لەوەی کە گوێم لێ بێ، مەزەندەم کرد دەڵێ: "باوکی ئێمە کە لە ئاسمانیت، ناوت پیرۆز بێت... مەمانخەرە سەر وەسوەسە، بگرە لە بەدی ڕزگارمان بکە..."

لە نزیک مێزی نووسینەکەوە دانیشتم و نەختێک دیگیتالیس(*)م بۆ نووسی.

کاتێ ڕەچەتەکەم دایێ، درێژەم بە قسەکانم دا:

باشیش نییە بۆ قەشە کە هەموو ئەم هاوینە گەرمە بچێت بۆ شار. مانەوە

---

(*) digitalis: دەرمانێک بۆ چارەسەری لاوازیی دڵ. و. کوردی

له گوێ زەریا بۆ ماوەی شەش هەفتە تەندروستیتان زۆر باش دەکات. پورلا یان ڕۆنێبی. بەڵام هەڵبەت قەشە دەبێ بە تەنیا سەفەر بکات.

**٥ی یولی**

یەکشەممەی هاوین. هەوا لە هەموو شوێنێک تەم و خنکاو، تەنیا خەڵکە هەژارەکە لە هاتوچۆدان. بەداخەوە خەڵکە هەژارەکە ناچنە دڵەوە.

لای سەعات چوار سواری کەشتییەکی هەڵمی گچکەی یەک چارۆکەیی بووم و بە مەبەستی شێوکردن بۆ یورگۆردسبریون چووم. کارەکەرەکەم بۆ ڕێورەسمی بەخاکسپاردن بانگهێشت کرابوو، پاشانیش لەو سەوزاییەدا قاوەی دەخواردەوە. ئەو کەسەی مردبوو نە خزمی بوو نە هاوڕێ، بەڵام ڕێورەسمی بەخاکسپاردن بۆ ژنێک لە چین و توێژی وی، خۆشییەکی گەورە بوو، بۆیە دڵم نەهات ڕوخسەتی نەدەمێ. کەواتە لەماڵەوە چ شێوێک نەبوو. لە ڕاستیدا منیش چەند ناسیاوێکم لە ڤێلایەک لە کۆدورگە داوەتیان کردبووم، بەڵام چ مەیلێکم نەبوو بچم. زۆر حەزم نە لە ناسیاو و نە لە ڤێلا و نە لە کۆدورگەشە. لە پێشی پێشەوەش لە کۆدورگە. دیمەنێک جنراو وەک کالۆپس(*). دورگەی بچووک بچووک، ئاوی کەم، گردۆڵکەچیای نزم و درەختی کورتەبنە. دیمەنێکی ڕەنگپەڕیو و هەژارانە، خوان ڕەنگی سارد، زیاتر خۆڵەمێشی و شین، باوەجوو هەڵبەت نە ئەوەندە هەژارانە کە خوان شانازیی چۆڵەوانی بێت. کاتێ دەبیستم خەڵک جوانیی سروشتی کۆدورگە پەسەن دەدەن، هەمیشە خانەگومان دەبم لەوەی کە بێجگە لەوە شتی تریان لە خەیاڵدا بێت، بە تاووتوێکردنێکی وردتر دەردەکەوێ خانەگومانییەکەم نزیکەی هەمیشە دەیپێکێ. یەکێکیان بیر لە هەوای سازگار و مەلەگای جوان دەکاتەوە و دووەمیان لەبەلەمە چارۆکەدارەکەی و سێیەمیشیان لە ئاببۆرە بچووکە(**)،

---

(*) kalops: جۆرە خۆراکێکە لەگەڵ پارچەگۆشتی گەورە لە سۆسدا. و. کوردی

(**) جۆرێک ماسیی ناو ئاوی شیرینە. و. کوردی

هەموو ئەمانەش لەژێر ناوی سروشتی جواندا جێگە دەکەنەوە. لەم ڕۆژانەدا لەگەڵ کیژێکی گەنجدا قسەم کرد کە شەیدای کۆدورگە بوو، بەڵام لەمیانەی قسەکردنماندا دەرکەوت کە ئەو لە ڕاستیدا حەزی لە خۆرئاوابوونەکان و هەروەها ڕەنگبێ لە قوتابییەکیش بێت. ئەو بیری چووبووەوە کە خۆر لە هەموو شوێنێک هەر ئاوا دەبێ و قوتابییش قابیلی جێگۆڕکێیە. پێم وانییە من بەرامبەر جوانیی سروشت تەواوێک داخراویم، بەڵام دەبێ دوورتر سەفەری بۆ بکەم، بۆ ڤێتێرێن یان سکۆنێ یاخۆ بۆ زەریا. ئەوە شتێکە کە بە دەگمەن کاتم بۆی هەیە، لەو سێ چوار کیلۆمەترەی دەوروبەری ستۆکهۆڵمەوە هەرگیز ڕێکەوتی دیمەنێکم نەکردووە کە بکرێت لەگەڵ ستۆکهۆڵم خۆی- لەگەڵ یورگۆردێن و هاگا و پیادەڕۆکانی گوێ ڕووبارەکەی دەوروبەری گراند بەراورد بکرێت. لەبەر ئەوەیە کە زیاتر هاوینان و زستانان لە شار دەمێنمەوە. زۆر بەوەش خۆشحاڵم، چونکە وەک کەسێکی تەنیا حەزێکی هەمیشەییم هەیە خەڵکانی دەوروبەرم ببینم- خەڵکانێکی بێگانە کە نایانناسم و پێویست نییە قسەیان لەگەڵدا بکەم.

ئاوها گەیشتمە یورگۆردسبریون و مێزێکی لای دیوارە شووشەییەکەی پاڤیۆن(*)ە نزمەکەم دەس کەوت. گارسۆنەکە بە لیستی خۆراکەوە بەرەو لام کەوتە خۆ و لەسەرخۆ دەستماڵێکی پاکی بەسەر پاشماوەی ئەو سۆسی گۆشتی سوورەوەکراوی گوێلک و خەرتەلەی باتییەدا هێنا، کە شێوخۆرانی پێشووتر جێیان هێشتبوو، ئەوسا یەکسەر لیستی شەرابی بۆ ڕاگرتم، بەو پرسیارە کورتە خێرا و لەناکاوە: چابلیس(**)؟ ئەوەی ئاشکرا کرد کە زەینی ڕەنگ بێ وەک زەینی زۆر پرۆفیسۆر جێگای بێژمار فۆندی زانیاری وردی تێدا بێتەوە. من چ مشتەرییەکی هەمیشەییی ڕێستۆران نیم، بەڵام ئەوە ڕاستە کە کاتێ جاروبار لەدەرەوە شێو دەکەم، نزیکەی هەرگیز جگە لە چابلیس هیچ شەرابێکی تر ناخۆمەوە. گارسۆنەکە لەو پیشەیەی خۆیدا دێرین و

(*) paviljongen: لا خانوو، خانووچکە، زڕە خانوو. و. کوردی

(**) chablis: جۆرە شەرابێکی سپی دەڤەری چابلیس. و. کوردی

مشتەرییەکانی خۆی دەناسین. ئەشوەی بەرایی جحێڵیی بە هاوسەنگڕاگرتنی سینییە پۆنش(*) لە بێرنس(**) دامرکاندبووەوە، بە جیدییەتی تەمەنێکی کامڵتریش ئەرکی ئاڵۆزتری لە ئەستۆ گرتبوو وەک گارسۆنی خۆراک لە ڕیدبێری و هامبۆرگێر بورس، کێش چوزانێ گوناهی ئەوە لە ئەستۆی چ قەدەرێکی تێپەڕ و بێباکدایە کە ئێستا ئەو بە تەپڵی سەرێکی تەنک لە قژ و بە جلکێکی ڕەسمی چەورترەوە لە جێگایەکی شتێک ساکارتردا خەریکی پیشەکەی بێت. ئەو لەگەڵ ساڵاندا خەسڵەتێکی پەیدا کردووە بەوەی کە هەموو شوێنێک بۆنی خواردنی لێ بێ و تەپەدۆری بوتڵی لێ هەڵبپچڕێت، بە ماڵی خۆیان بزانێت. شادمان بووم کە تەماشایم کرد، نیگایەکمان لە لێک حاڵیبوونێکی شاراوە ئاڵوگۆڕ کرد.

سەیرێکی خەڵکەکەی دەوروبەرم کرد، لە نێزیکترین مێزی پاڵمدا ئەو گەنجە لەبەردڵانە دانیشتبوو کە بەردەوام جگەرەی لێ دەکرم، لەگەڵ کچە هاوڕێکەیدا کە کچێکی جوان و کورتەباڵا و خوان چاوانێکی بزێوی مشکئاسا و لە دوکانۆچکەیەکدا کاری دەکرد، بە ئیشتیاوە دەیخوارد. کەمێک لەولاتر ئەکتەرێک لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا دانیشتبوو دەمی بە پایەدارییەکی تەواوێک قەشانەوە دەسڕی. دووریش لە قوژبنێکدا پیرەمێردێکی تەنیا و سەیر کە لەماوەی بیست و دوو ساڵ لەمەوبەرەوە لە جادە و کافەکانەوە دەیناسم، دانیشتبوو، خواردنەکەی لەگەڵ سەگەکەیدا، کە ئەویش پیر و پێستەکەی نەختێک سپی بوو، بەش دەکرد.

---

(*) punsch: بادەیەکی زەردی شیرینە. و. کوردی

(**) Berns: ڕێستۆرانێکی بەنێوبانگی شاری ستۆکهۆڵمە، ساڵی ١٨٦٣ لەلایەن حەڵواچی ئەڵمانی ڕۆبێرت بێرنسەوە کراوەتەوە و ساڵی ١٨٨٦ بەرفراوان کراوە. ئەم ڕێستۆرانە لە ژیانی ئەدەبیی شاری ستۆکهۆڵمدا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە و جێگەی کۆبوونەوە و یەکتربینینی هونەرمەند و نووسەران بووە. کتێبی (ژوورە سوورەکە) ی ستریندباری بەناوی یەکێک لە ژوورەکانی ئەو ڕێستۆرانەوە ناونراوە. و. کوردی

شەرابی چابلیسەکەم بۆ هات و بۆ خۆم دانیشتبووم و لەزەتم دەبرد لە گەمەی تاڵەکانی تیشکی خۆر لەگەڵ خواردنەوە سووکەڵەکەی ناو پەرداخەکەمدا، کاتێک تەواوێک لە نزیکمەوە گوێم لە دەنگی زەعیفەیەک بوو کە پێم وابوو دەیناسم، سەرم هەڵبڕی. ئەوە خێزانێک بوو رێک لەوکاتەدا هاتنە ژوورەوە، پیاوێک و خاتوونێک و کوڕێکی گچکە لە تەمەنی چوار پێنچ ساڵاندا، منداڵێکی زۆر جوان بوو، بەڵام دەبەنگانە و مەسخەرەئامێز گۆڕیبوویان و بلوسێکی شینی تۆخی ئاوریشمییان بە ئێخەی دانتێلەوە لەبەرکردبوو. ژنەکە دەمڕاست بوو، دەنگیم پێ ئاشنابوو: لەوێدا دادەنیشین، نەء لەوێ نا، ئەوێ هەتاوی لەسەرە، نەء، لەوێ هیچ کوێمان لێ دیار نییە، کوانێ سەرۆک گارسۆنان؟

لەناکاوێکڕا ناسیمەوە. هەمان ئەو کیژە گەنجە بوو کە جارێکیان لە ژوورەکەمدا لەسەر ئەرزەکە خۆی گرمۆڵە کرد و سواڵ و داوای لێ کردم کۆمەکی بکەم – تا لەو مناڵە رزگاری بکەم کە چاوەڕێی دەکرد. ئەوسا شووی بەم شاگرد دوکانە کردووە کە لە دڵەوە حەزی لێ کردبوو، منداڵەکەی بوو– کەمێک خێراتر، بەڵام ئێستا ئەوە چ قەیدی نییە – واتە ئەوەتا ئێستا ئەم بەڵگە بینراوەی تاوانمان هەیە بە بلوسی ئاوریشم و ئێخەی دانتێلەوە.. ئەدی باشە خاتوونی گچکەم، ئێستا چ دەڵێن– ئەدی من راست نەبووم؟ ریسواییەکە بەسەرچوو، بەڵام کوڕە گچکەکەتان بۆ ماوەتەوە و پێی شادمانیت...

بەڵام لە فیکرەوە دەچم بڵێی هەر بەڕاست ئەمە هەمان مناڵ بێت. نەء، ناکرێ هەو بێ. ئەم کوڕە تەمەنی چوار ساڵە، ئەوپەڕەکەی پێنج ساڵە، بەڵام زیاتر لە حەوت یان هەشت ساڵ بەسەر ئەو چیرۆکەدا تێ پەڕیوە: ئەوە رێک لە سەرەتای دامەزراندنمدا بوو. بەڵام دەبێ چ بەسەر ئەو منداڵەدا هاتبێ؟ دەشێ بە جۆرێک لە جۆرەکان لەبار برابێ. دەی، ئەمەشیان قەیدی نییە، لەبەرئەوەی پێ دەچێ دواتر شکاوییەکانیان چاک کردبێتەوە.

بێ لەوەش کاتێ لە نزیکەوە تەماشای ئەو خێزانە دەکەم، زۆر ناچنە

دڵمەوە. خاتوونەکە گەنجە و هێشتا زۆر جوانە، بەڵام نەختێک قەڵەو بووە و ڕوخساریشی تا ڕادەیەک سوورکەڵە بووە. من گومان دەکەم کە پاش نیوەڕوان بۆ دووکانی حەڵوافرۆشییەکان بڕوا و لەوێ بیرە بە شیرینی هەویرییەوە بخواتەوە و لەگەڵ هاوڕێکانیدا بکەوێتە زەم و زەمکاری. مێردیش دۆنجوانێکی شاگرد دووکانە. گەر بە ڕوخساری دەرەوە و هەڵسوکەوتە نەشیاوەکانیدا حوکمی بەسەردا بدەم، ئەوسا دەبێ بە ناچاری باوەڕ بەوە بێنم کە وەک کەڵەباب بێ وەفایە. وێڕای ئەوەش هەردووکیان خاوەن ئەو شێوازەن کە پێشوەخت بەسەر گارسۆنەکەدا ببۆڵێنن بۆ بێگوێییەک کە چاوەڕێی لێ دەکەن: شێوازێک کە دڵم تێک هەڵدێنێ. بە یەک وشە: شەلاتیەتی.

کارتێکردنە تێکچڕژاوەکانم بە قومێکی گەورە لەو شەرابە سووکەڵە ترشە شوشتەوە و لە پەنجەرە کراوە گەورە کەوە لە دەرەوەم ڕووانی. لە دەرەوە دیمەنەکە زەنگین و ئارام و گەرم لەبەر هەتاوی پاش نیوەڕۆدا ڕاکشابوو. کەناڵەکە سەوزایی کەنارەکان و شینایی ئاسمانی پێچەوانە دەکردەوە. دوو بەلەمی بچووک بە سەوڵ لێدەری تریکۆی خەتخەت لەبەردا، بێدەنگ و سووکەڵە، بە خێرایی بەژێر پردەکەدا تێ پەڕین و دیارنەمان، پاسکیلسوارەکان بەسەر پردەکەدا غلۆر دەبوونەوە و لە ڕێگاکاندا بڵاودەبوونەوە، لە گژوگیای ژێر درەختە گەورەکاندا خەڵکی دەستە دەستە دانیشتبوون و لەزەتیان لە سێبەر و ئەو ڕۆژە جوانە دەبرد. دوو پەپوولەی زەردیش بەسەر مێزەکەمەوە باڵەفڕێیان بوو.

لەکاتێکدا کە ئاوها دانیشتبووم و لێ گەڕابووم نیگام لەو سەوزاییە قووڵەی هاویندا لە دەرەوە ڕۆبچێت، خایلەم هەڵخزایە نێو فانتاسیایەکەوە کە جار بەجار کەیفمی پێ سازدەکەم. من نەختێک پارەی پاشەکەوتم هەیە، دە هەزار کرۆنێک دەبێ یان کەمێک زیاتر بە سەنەدی دراوی. هەڵبەت ڕەنگ بێ پێنج شەش ساڵێکی تر بتوانم خانوویەک لە دەرەوەی شار دروست بکەم. بەڵام لە کوێی دروست بکەم؟ دەبێ لە گوێ زەریادا بێت. دەبێت لە کەنارێکی کراوەدا بێت، بەبێ دوورگەی بچووک و بەردە دوورگە. من ئاسۆیەکی ئازادم

گەرەکە و دەخوازم گوێم لە زەریا بێت. گەرەکمە زەریا لای خۆرئاواوە بێت، دەبێ خۆر لەوێوە ئاوا بێ.

بەڵام شتێکی تریش هەیە کە هێندەی زەریا گرنگە، سەوزاییی چڕوپڕ و درەختگەلی گەورەشم گەرەکن کە با بەناویاندا بوژێنێ. نە سنۆبەر و نە چنار. ئا، بۆ سنەوبەر قەیدی ناکا کاتێ کە بەرز و ڕێک و بەهێزن و توانراوە وەک ئەوە بن کە دەبێ ببن، بەڵام هێڵی بەرجەستەی ناڕێکی دارستانێکی چنار ڕووەو ئاسمان بە تەرزێک ئازارم دەدات کە ناتوانم ڕاڤەی بکەم. جگە لەوەش هەڵبەت لە دەرەوەی شاریش وەک ناو شار جاروبار باران دەبارێت، جا دارستانێکی چنار لە کەشێکی باراناویدا تەواوێک نەخۆش و دڵم ناخۆش دەکات. نەء، دەبێ مێرگێکی گوندییانە بێ بە قەدپاڵێکەوە کە بە هێواشی بەرەو کەنار لێژ بووبێتەوە و چەند جۆرێک لە درەختگەلی گەورەی گەڵادار، گومبەزی سەوز بەسەر سەرمدا لێ دەن.

بەڵام بە داخەوە، سروشتی کەنار زەریا بەو شێوەیە نییە، دڵڕەق و پیسکەیە. بە هەڵکردنی با لە زەریاوە درەختەکان ڕووتەڵ و گچکە و دەچنەوە یەک. ئەو کەنار زەریایەی من گەرەکمە خانووەکەمی لێ ڕۆبنێم و لێی بژیم، قەت نایبینم.

ڕۆنانی خانووش بۆ خۆی حەکایەتێکە. دوو ساڵی گەرەکە بەر لەوەی تەواو بێت، خۆ ڕەنگیشە بنیادەم لەو ماوەیەدا بمرێت، ئینجا سێ ساڵێکی تریشی دەوێت تا تەواو ڕێکوپێک دەبێ، هەروابێتەوە هێشتا نزیکەی پەنجا ساڵێکی دەوێ تا تەواو دڵگیر دەبێ...

خۆ دواجار دەبێ خاتوونێکیش بێتە ناو مەسەلەکەوە. بەڵام ئەمە ئێستا دیوێکی تریشی هەیە. من پێم قورسە بەرگەی ئەو خایلەیە بگرم کە کاتێ نوستووم کەسێک تەماشام بکات. نوستنی منداڵێک جوانە، هەروەها نوستنی کیژێکی گەنجیش جوانە، بەڵام بە دەگمەن نوستنی پیاوێک جوانە. دەڵێن نوستنی قارەمانێک لەپاڵ ئاگری خێوەتەکەیدا کە کۆڵەبارەکەی کردووەتە باڵشت، جوانە تەماشای بکەیت، ئەمەش ڕێی تێ دەچێ، چونکە ئەو تەواوێک

ماندووه و خەوێکی قووڵی لێ کەوتووه. بەڵام دەبێ ڕوخساری من چۆن بنوێنێ کاتێ خەوێکی قووڵم لێ دەکەوێ؟ من گەر بتوانم بە نوستوویی خۆم ببینم، ئەوا بە دەگمەن خۆم دەبینم، کەمتر لەوەی کە کەسێکی تر دەبێ بیبینێ.

نەء، هیچ خەونێکی بەختەوەرانە نییە، کە دواجار لە کلکەوە خۆی نەگەزێت.

هەروەها زۆر جاریش بیردەکەمەوە کە ئاخۆ ئەگەر هیچ کتێبێکم نەخوێندبایەوە و هیچ تابلۆیەکی هونەریم نەبینیبا، چ سروشتێکم هەڵدەبژارد. ڕەنگ بێ ئەوکات تەنانەت هەرگیز لە بیری هیچ جۆرە هەڵبژاردنێکدا نەبووبام – ڕەنگە ئەوکات سروشتی کۆدورگەم بە تەپۆڵکەکانییەوە پێ دڵگیربا. وا دیارە هەموو خایلە و خەونەکانم لە بارەی سروشتەوە لەسەر کاریگەریی شیعرێک یان تابلۆیەک ڕۆنرابێت. من لە هونەرەوە تامەزرۆبووم ئارەزووی پیاسەم بە مێرگی گوڵزارە دێرینە فلۆرێن(*)ییەکاندا هەبێ و لەزەریای هۆمیرۆسدا جۆلانە بکەم و لە دارستانۆچکەی پیرۆزی بۆکلین(**)دا چۆک دابدەم. ئاخ، چاوانی هەژاری ئێمە چی لە دنیادا دەبینی و تەنیای تەنیا چیی دەکرد، گەر ئەم سەدان یان هەزاران مامۆستا و هاوڕێیە نەبان کە شیعریان بۆ ئێمە نووسی و بیریان بۆ ئێمە کردەوە. زۆرجاران لە گەنجیمدا بیرم دەکردەوە: ئەوەی بۆی لوا ئامادە بێت، ئەو کەسەیە کە توانی ئامادە بێت. ئەوەی کە بۆ جارێک لە جاران توانیویەتی شتێک بدا، بەردەوام وەری نەگرتووە. زۆر وێرانەییە کە بە تەنێ بە ڕۆحێکی نەگەییوەوە بڕۆیت، مرۆڤ نازانێت چ دابهێنێ تا هەست بکات کە شتێکە و مانایەکی هەیە و کەمێک ڕێزی بۆ خۆی هەیە. دیارە ئەوە بەختەوەرییەکی گەورەیە کە زۆربەی زۆری خەڵکی لەم لایەنەوە بێ ئیدیعان. من وا نەبووم، ئەوەش بۆ ماوەیەکی درێژ ئازاری دام،

---

(*) ئاماژە بە شاری فلۆرێنسی ئیتاڵیا، شاری هونەر و مۆزە و کتێبخانە گەورەکان. و. کوردی

(**)Arnold Böcklin: (١٨٢٧– ١٩٠١) نیگارکێشێکی سویسرایییە و ناسراوە بە کێشانی دیمەنی ڕۆمانتیکیی کارەکتێرە سیمبولیکی و ئەدەبییەکان، لە درەوشاوەترین ڕەنگ و بە وردەکارییەکی سروشتییانەوە. و. کوردی

بەڵام پێم وایە ئێستا خراپترین شتی تێ پەڕیوە. هەڵبەت نەمتوانی ببمە شاعیر. من هیچ شتێک نابینم کە ئەوانی تر بینیویانە و فۆرم و قاڵافەتیان پێ بەخشیوە. هەڵبەت من هەندێک نووسەر و نیگارکێش دەناسم کە پێم فیگۆری سەیر و سەمەرەن. ئەوانە هیچ شتێک ناخوازن، یان کاتێ کە شتێک دەخوازن، پێچەوانەکەی ڕەفتار دەکەن. ئەوانە تەنیا چاو و گوێ و دەستن. بەڵام من ئیرەیییان پێ دەبەم. بەو تەرزە نا کە بمەوێ لەبەر خاتری ڕوانگەی ئەوان مەودا لە حەزی خۆم بگرم، بەڵام ئاواتەخوازی ئەوەم هەروا چاو و گوێی ئەوانم هەبان. هەندێ جار، کاتێ یەکێکیان دەبینم بێدەنگ و پەرت دانیشتووە و لە خاڵیەتی دەنۆڕێت، لە فیکرەوە دەچم: ڕەنگە هەر ڕێک ئێستا شتێک ببینێت کە پێشتر کەسی تر نەیبینیوە و لە ماوەیەکی کورتیشدا هەزاران کەسی تر و لەناویشیاندا من، ناچاری بینینی ئەو شتە بکات. دیارە لەوە ناگەم جوانترین شتێک کە ئەوان بەرهەمی دەهێنن، چین –هەر بە ڕاستی تێی ناگەم! بەڵام دەزانم و پێشبینی دەکەم کە هەر ئەوان ڕۆژێک لە ڕۆژان ددانیان پێ دابنرێ و بەناوبانگ ببن، ئەوا منیش تێ دەگەم و ستایشیان دەکەم. وەک مۆدە تازەکانی جلوبەرگ و مۆبلە و هەموو شتەکانی تر، تەنیا ڕەق و وشکەکان، ئەوانەی کە لە دەمێکەوە لێ بوونەتەوە، دەتوانن خۆیانی لەبەردا ڕابگرن. ئەدی شاعیرەکان خۆیان، ئایا هەر بە ڕاستی ئەوە ئەوانن کە یاساکانی سەردەمیان نووسیون؟ بەڵێ، خوا دەیزانێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من بە حاڵ پێم وایە وابن. ڕاستتر پێم وایە ئەوان ئامێری مۆسیقایین کە زەمەن دەیانژەنێ، چەنگی هەوایین کە با سترانیان تێدا دەچڕێ. ئەدی من چیم؟ شتێکی زۆر نیم. من خاوەن چاوانی خۆم نیم. هەڵبەت من تەنانەت ناتوانم بە چاوانی خۆم شەراب و تموورەکانی سەر مێزەکەی ئەوێ ببینم، بە چاوانی ستریندبێری(*) دەیانبینم و بیر لە شامی ئاهەنگێک لە ستال مێستەر گۆردێن دەکەمەوە کە لە جحێڵیدا خواردی. کە تازەکی بەلەمەوانەکان بە

(*) August Strindberg: (١٨٤٩– ١٩١٢) نووسەر و شانۆنامەنووسی بەناوبانگی سوێدی.

فالینە خەتخەتەکانیانەوە بە کەناڵەکەدا تێ پەڕین، بۆ ساتێک وا هاتە پێش چاوم کە سێبەرەکەی مۆپاسان(*) پێش ئەوان بە خێرایی تێ پەڕی.

ئێستاش کاتێ لەلای پەنجەرە کراوەکەمدا دانیشتووم و لەبەر ڕووناکییەکی پرتەپرتکەردا ئەمە دەنووسم – ئاخر من هیچ حەزم لەوە نییە دەسکاریی چرای نەوت بکەم، کارەکەرەکەشم دوای قاوەخواردنەوە بە کولیچەمەنییەوە لە ڕێورەسمی بەخاک سپاردنەکەدا، خەوێکی خۆشی لێ کەوتووە، بۆیە دڵم نایەت هەڵیسێنم– ئێستا، کە بڵێسەی ڕووناکییەکە لەسەر ڕوخسارم پرتەپرت دەکات و سێبەرەکەم لەسەر کاخەزی سەوزی دیوارەکە.... وەک بڵێسەیەک کە بیەوێت ژیانی تێ بێت، دەشەکێ و دەلەرێتەوە، ئانارسن(**) و چیرۆکەکەیم لەبارەی تارماییەوە بیر دەکەوێتەوە، پێم وایە من خۆم ئەو تارماییەم، کە گەرەکیەتی ببێتە ئینسان.

**

### آی یولی لە بەیانیدا

دەبێ ئەو خەونە تۆماربکەم کە شەو بینیم: لای تەختەنوێنەکەی قەشە گریگۆریۆسەوە دانیشتبووم، قەشە نەخۆش بوو. بەشی سەرەوەی جەستەی ڕووت بوو، منیش گوێم بۆ لێدانی دڵی ڕادێرابوو. تەختەنوێنەکەی لە ژووری

---

(*) Maupassant: گی. دی. مۆپاسان ١٨٥٠–١٩٠٣ چیرۆکنووسی بەنێوبانگی فەرەنسی. قوتابی فلۆبێر و ڕۆمان و نۆڤلێتنووس لە ئاستێکی گەلێک بالادا. یەکەمجار وەک ناتورالیستێک دەستی پێ کرد و پاشان لەگەڵ ڕۆژگاردا بەرەو ڕیالیستێکی سیکۆلۆگیست هەنگاوی نا. لە کارە جوانەکانی مۆپاسان: ژیانێک، دڵی ئێمە، خانووی تێلیێر و بەهێز وەک مردن. و. کوردی

(**) Hans Christian Andersen: (١٨٠٥– ١٨٧٥) شاعیر و ڕۆماننووس و چیرۆکنووسی بەنێوبانگی دانیمارک. لەنێو ١٥٦ چیرۆکە بەناوبانگەکەیدا: مراوییە ناشیرینەکە، کچەکە و دەنکە شخارتەکان، جلە تازەکانی قەیسەر ناوبانگێکی جیهانییان هەیە و خوێنەری ئێمەشیان پێ ئاشنان. و. کوردی

ئیشکردنی بوو، ئۆرگێک لە قوژبنێکدا بوو و کەسێک دەیژەند، نە کۆراڵ بوو نە میلۆدی، تەنیا شێوە دەربڕینگەلێکی بێ فۆرمی فرەئاواز بوو، کە دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە.. دەرگـایەک کرابووەوە، ئەوە نیگەرانی کردبووم، بەڵام قاچم لەدووم نەدەهات بچم دایخەم.

قەشە پرسی: خەتەرە؟

وەڵامیم دایەوە: نەء، خەتەر نییە، بەڵام ترسناکە.

مەبەستم ئەوە بوو کە ئەوەی بیرم لێ کردووەتەوە بۆ خۆم ترسناکە. لە خەونەکەدا پێم وابوو بەشێوەیەکی قووڵ و جوان گوزارشتم لەخۆم کردووە.

درێژەم دایێ: بەڵام هەر بۆ دڵنیایی هەڵبەت دەتوانین بنێرین بۆ دەرمانخانە بە دوای چەند کەپسوولێکی شامی عیساییدا.

قەشە پرسی: چما دەبێ نەشتەرگەری بکرێم؟

من سەرم بۆ لەقاند.

پێ دەچێ ئەوە شتێکی پێویست بێ. دڵی قەشە تەواوێک بە عەمەل نەماوە، زۆر کۆن بووە. ڕوخسەتمان وەرگرتووە دەری بێنین. وەکی تریش ئەوە نەشتەرگەرییەکی هەر زۆر بێ مەترسییە، دەتوانرێ بە چەقۆیەکی هاکەزایی کاخەزبڕین ئەنجام بدرێت.

ئەوەم وەک هەقیقەتێکی زانستییانەی زۆر ساکار هاتە بەرچاو، هەر ڕێک لەو کاتەدا چەقۆیەکی کاخەز بڕینیشم بە دەستەوە بوو.

تەنیا دەسەسڕێک دەنێینە سەر دەموچاوت.

قەشە لەژێر دەسەسڕەکەدا بە دەنگی بەرز دەینالاند. بەڵام لەبری ئەوەی نەشتەرگەریی بۆ بکەم، بە خێرایی لەسەر دیوارەکە دەستم بە دوگمەیەکدا نا.

دەسەسڕەکەم لابرد. قەشە مردبوو. دەستم لە دەستییەوەدا، وەک سەهۆڵ سارد بوو. تەماشای کاتژمێرەکەم کرد.

بە خۆم گوت: زیاد لە دوو سەعاتە مردووە.

خانم گریگۆریۆس کە لەسەر ئۆرگەکە دانیشتبوو ئۆرگی دەژەند، هەستا. بەرەو لام هات. پێم وابوو تەماشاکردنەکەی نیگەران و خەمین بوو، چەپکێک گوڵی تاریکی بۆ ڕایەڵ کردم. ئەوسا بۆ یەکەم جار بینیم زەردەخەنەیەکی دووفاقییانە لەسەر لێویەتی و جەستەشی ڕووتە.

باسکم بەرەو ڕووی کردەوە و ویستم بە خۆمەوە بیگوشم، بەڵام ئەو خۆی لێ لادام، هەر لەوکاتەدا کلاس ڕێکێ لەبەر دەرگا کراوەکەدا ڕاوەستابوو.

گوتی: دوکتۆر گلاس، بە سیفەتی جێگری بەڕێوەبەری کاتی دادگا بەندکردنتان رادەگەیەنم!

وەڵامیم دایەوە: تازە ئیدی درەنگە. بۆ تۆ هیچ نابینیت؟

ئاماژەم بۆ پەنجەرەکە کرد. تیشکێکی سووری ئاگر لە هەردوو پەنجەرەی ژوورەکەوە دەهاتە ژوورەوە، کوتوپڕ وەک ڕۆژی نیوەڕۆ ڕووناک بووەوە، دەنگێکی ژنانە کە پێ دەچوو لە ژوورێکی ترەوە بێت، دەینالاند و دەکڕووزایەوە: دنیا دەسووتێ، دنیا دەسووتێ!

منیش وەئاگابوومەوە.

هەتاوی بەیانی ڕێک لە ژوورەکەی دەدا، دوێنێ شەو کە بۆ ماڵەوە هاتبوومەوە، پەردەی پەنجەرەکانم دانەدابوونەوە.

سەیرە. من ئەم ڕۆژانەی دوایی هەرگیز بیرم لەو قەشە دزێوە و ژنە جوانەکەی نەکردبووەوە. نەمویستووە بیریان لێ بکەمەوە.

هەڵبەت قەشە گریگۆریۆس سەفەری بۆ پورلا کردووە.

**

من هەموو خایلەکانم لێرەدا نانووسمەوە.

بە دەگمەن خایلەیەک کە یەکەم جار بۆم دێت، دەنووسمەوە. چاوەڕێ دەکەم و تەماشا دەکەم تا بزانم هەمدیس بۆم دێتەوە.

## ٧ی یولی

باران دەبارێ، منیش دانیشتووم و بیر لە شتی ناخۆش دەکەمەوە.

بۆچی پایزی ڕابردوو دەستم نا بە ڕووی هانس فاهلێنەوە کاتێ هات بۆ لام و داوای پەنجا کرۆنی بە قەرز لێ کردم؟ راستە کە من زۆر کەم ئەوم دەناسی. بەڵام ئەو هەفتەی دواتر ملی خۆی بڕی.

باشە ئەدی بۆچی ئەو کاتەی دەچووم بۆ قوتابخانە خۆم فێری گریکی نەکرد؟ ئەم شتە بە ڕادەیەک قەڵسم دەکات کە لەوەیە نەخۆشم بخات. هەڵبەت چوار ساڵ گریکیم خوێند. ئاخۆ بڵێی لەبەر ئەوە بووبێ باوکم ناچاری کردم لەبری ئینگلیزی، ئەو زمانە هەڵبژێرم کە بڕیاری خۆم دابوو هیچ فێری نەبم؟ چۆن مرۆڤ دەتوانێ ئاوها ئاژەڵانە گێل بێت! خۆ من هەموو شتێکی تر فێربووم، بەو شتە قۆڕەشەوە کە پێی دەگوترێت لۆژیک. بەڵام چوار ساڵ گریکیم خوێند، کەچی فڕم پێوەی نییە.

ناکرێ خەتای مامۆستاکەشم بووبێت، چونکە ئەو دواتر بووە وەزیر.

حەزدەکەم هەمدیس بە کتێبەکانی قوتابخانەدا بگەڕێم و بزانم ئاخۆ دەتوانم ئێستا خۆم فێری شتێک بکەم، ڕەنگە هێشتا درەنگ نەبێ.

**

لە فیکرەوە دەچم کە دەبێ ئەوە چۆناوچۆنی بێت کاتێ بنیادەم تاوانێکی کردبێ و لێی پەژێوان بێت.

**

لە فیکرەوە دەچم کە ئەگەر کریستین هەر ئێستا شێوی ئامادە نەکردبێت...

**

با درەختەکانی گۆڕستانەکە ڕادەوەشێنێت و باران لە جۆگەلەکاندا لێزمە دەکات. ژاتێکی هەژار بە بوتڵێکەوە لە گیرفانیدا پەنایەکی لەژێر میچی کڵێسادا، لە قوژبنێکدا بەپاڵ کۆڵەگە ئەستوورەکەوە، دۆزیوەتەوە. پاڵی بە

شــورا ســوورەکــەی کـڵـێـســاوە داوە و نیگای پاک و ئارامی لە نێـو هەورە بزۆزەکـانـدا سـەرگـەردانە. ئاو لە دوو درەخـتـە باریکەلەکـەی لای گـۆڕەکـەی بێللمان(*) دەتکێ. لەملا لە سـەروو سـوچی گۆڕسـتانەکەوە خـانووێکی بەدناو هەیە، کیـژێک بـە ژێرکراسـەوە بە ئەسپایی دێتـە بـەر پەنجـەرەیەک و پەردەکە دادەداتەوە.

بەڵام لە خوارەوە قەشەی بەرپرس بە وریاییەوە بەنێـو گۆڕەکانـدا و بە نێو قـوڕدا بە چەتر و پاتەوە دەڕوا و هـەر ئێـسـتـا بە دەرگـا گـچکەکـەدا خـۆی بە ساکریستیان(**)ەکەدا دەکات.

**

بەم بۆنـەیەوە، ئەرێ بۆچی هەمـیـشــە قـەشـە لە دەرگـایەکی دواوە خـۆی بە کلێسادا دەکات؟

### ٩ی یولی

هێشتا هەر باران دەبارێ. ڕۆژانێکی ئاوها خـزمایەتییان هەیە لەگەڵ هەموو ژەهرێکی نهێنی لە ڕۆحمدا.

تازەکی کە لە سـەردانی نەخۆشەکانم بەرەو ماڵەوە دەگەڕامـەوە، لە سوچی شەقامێکدا دەمودۆیەکی خێرام لەگەڵ پیاوێکدا کرد، کە حەز بە بینینی ناکەم. جـارێکیـان بـەبێ دەربەسـتـیـیـەکی قـووڵ و جـوانـەوە بەرخـوردی کـردم، لە هەلومـەرجـێکی ئاوهاشـدا چ شـیـاوییـەک بۆ ئەوە نابینم کـە بە ئاسـایی وەری بگرم.

من حەزم لە شتی ئاوها نییە. ئەوە زیان بە تەندروستیم دەگەیەنێت.

**

(*) Karl Bellma: (١٧٤٠ –١٧٩٥) شاعیری ناوداری سویدی. و. کوردی
(**) sakristian: ژوورێک لە کلێسادا تایبـەت بـە خـۆگـۆڕینی قـەشـەکان و هـەروەها شمەکە پیرۆزەکانیشی لێ هەڵدەگیرێن. و. کوردی

لای مێزەکەوە دانیشتووم و چەکمەجە دوای چەکمەجە دەردەکێشم و لە کاغەز و شتی کۆن دەنۆڕم. پارچەیەکی گچکە ڕۆژنامەی بڕدراو و زەردهەڵگەڕاو دەکەوێتە دەستمەوە.

ئایا دوای ئەم ژیانە ژیانی تر هەیە؟ نووسینی: تیۆلۆگیست دوکتۆر هۆ. کرێمێر. نرخ: ٥٠ئورە(*).

وەحییەکانی جۆن بیونیان. لێدوانێک لەبارەی ژیانی ئاخیرەتەوە، خۆشییەکانی ئاسمان و ترسەکانی دۆزەخ. نرخ: ٧٥ ئورە.

گوڕی خۆی مرۆڤ. ڕاستەڕێگا بەرەو شەرافەتمەندی و دەوڵەمەندبوون. نووسینی: ئیس. سینیلێس. نرخ: بە بەرگی ئاسایی ٣ کرۆن و پەنجا ئورە. بە بەرگی زێڕینەوە: چوار کرۆن و ٢٥ ئورە.

باشە بۆچی من ئەم ئاگاداریيە کۆنانەم شاردوونەتەوە؟ بیرمە تەمەنم چواردە ساڵ بوو کە ئەم ئاگادارییانەم لە ڕۆژنامە لێ کردنەوە، ئەو ساڵە بوو کە سەروەت و سامانەکەی باوکم بەبا چوو. لە پارەی کەمی گیرفانم کەوتمە پاشەکەوتکردن. دواجار کتێبەکەی جەنابی سمیلێسم پێ کڕی، هەڵبەت بە بەرگی زێڕینەوە نا. هەر کە خوێندمەوە دەسبەجێ بە کتێبخانەیەکی دەستی دووم فرۆشتەوە. کتیبێکی تا بڵێی تووڕەهات بوو.

بەڵام ئاگادارییەکەیم ماوە. ئەمەیان بە نرختریشە.

ئەم وێنە کۆنەشم هەیە: وێنەی خانوویەکی هاوینە کە تەنیا چەند ساڵێک هەمانبوو. لەسەر ناوی دایکم، ناوی ماڵی ماریێ بوو.

وێنەکە زەرد هەڵگەڕاوە و ڕەنگی پێ نەماوە، وەک بڵێی تەمێک ژوور خانووە سپییەکەی تەنیبێ، دارستانی چنار لە دواوە. بەڵێ، لە ڕۆژانی تەم و باراناویدا خانووەکە ئاوها دەینواند.

---

(*) Öre: دراوێکی سوێدیی کەمبەهایە لە ئێستادا.

هەڵبەت من لەوێ هەرگیز هەستم بە ئاسوودەیی نەدەکرد. هاوینان لێدانێکی زۆرم بە دەستی باوکم دەخوارد. ئاخر من ئەوکات منداڵێکی چەتوون بووم، نە قوتابخانەم هەبوو نە دەرس و دەور.

جارێکیان نادادوەرانە لێدانم خوارد. ئەو لێدانە یەکێکە لە خۆشترین یادەوەرییەکانی منداڵیم. هەڵبەت ئەو لێدانە ئێشی پێ گەیاندم، بەڵام ڕۆحمی لاواندەوە. دوای ئەوە چوومە خوارەوە بۆ زەریاچەکە، تا ڕادەیەک زریان هەڵی کردبوو، کەفی زەریا خولی دەخوارد و لە ڕوخساری دەدام. بیرم نایەت دواتر هیچ کاتێک هەستم بە غەرقبوونێکی ئاوها خۆش لە هەستگەلی گرانبەهادا کردبێ. لە باوکم بوورام، ئەو خاوەن مەزاجێکی توند بوو، هەروەها نیگەرانیی زۆری بۆ کاروکاسپییەکەی هەبوو.

قورستر لەوە، بەخشینی بوو لەو هەموو جارانەدا کە دادوەرانە دەیکوتام، نازانم ئاخۆ هەر بە ڕاستی لێی بووراوم. وەک ئەو کەڕەتەی هەمدیس نینۆکم کرۆژتبووەوە گەرچی بە توندیش ئەوەم لێ قەدەخە کرابوو. وای چەند لێی دام! بە سەعات دوای ئەوە بەو دارستانە ناخۆشەدا و بەژێر لێزمەی باراندا دەسووڕامەوە و دەگریام و جنێوم دەدا.

باوکم هەرگیز ئارام نەبوو. بە دەگمەن شادمان بوو، کە ئاوهاش بوو، نەشیدەتوانی بەرگەی شادمانیی خەڵکانی تر بگرێت. بەڵام حەزی لە ئاهەنگکردن بوو، لە خەڵکە دەسبڵاوە غەمگینەکان بوو. ئەو دەوڵەمەند و بە هەژاری مرد. نازانم ئاخۆ کەسێکی سەرڕاست بوو یان نا، هەڵبەت لە سەودا و مامەڵەی زۆر گەورەدا بوو. ئەدی باشە کاردانەوەی من وەک منداڵێک بەرامبەر قسەیەک چی بوو، کە باوکم جارێکیان بە گاڵتەوە بە یەکێ لە هاوکاسپییەکانی خۆی گوت: "بەڵێ، گوستاڤی ئازیز، زۆر سانا نییە سەرڕاست بین، کاتێ کە پارەیەکی وا زۆر پەیدا دەکەین"... بەڵام سەبارەت بە خەڵکی، ئەو تا بڵێی توند و ڕەق و خاوەن تێگەیشتنی تەواوێک ڕۆشن و یەکلاکەرەوە بوو، سەبارەت بە ئەرک. خۆ مرۆڤ هەمیشە هەلومەرج بۆ خۆی دەدۆزێتەوە کە بەهانەیان بۆ ڕێزپەڕێک پێ بهێنێتەوە.

بەڵام لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو کە هەمیشە هەستم بە بێ مەیلییەکی زۆر بەهێز دەکرد بەرامبەری. چ عەزابێکم دەکێشا کاتێ وەک کوڕێکی بچووک دەبوو مەلەی لەگەڵدا بکەم و ئەو دەیویست فێری مەلەم بکات. جار لەسەر جار پێم وابووە کە لەوەدام نوقوم بم، کەچی وەک مارماسی لەنێو دەستیدا خۆم دەخزاند. هێندەی مردن، لەبەرکەوتنی جەستەی رووتی دەترسام. هەڵبەت ئەو مەزەندەی ئەوەشی نەدەکرد کە بەرکەوتنی جەستەیی لەو جارانەدا کە لێی دەدام، ئێش و ئازارەکەمی چ قووڵتر دەکردەوە. زۆر دواتریش لە سەفەر یان لە ڕێکەوتی تردا بۆم عەزاب بوو، کە دەبوو لە ژوورێکدا لەگەڵیدا بنووم.

لەگەڵ ئەوەشدا خۆشم دەویست. ڕەنگە زیاتر لەبەرئەوە بووبێ شانازیی بەوەوە دەکرد کە خاوەن مێشکێکی باشم. هەروەها لەبەرئەوەش کە هەمیشە جلکی جوانی لەبەر دابوو. جارێکیشیان ڕقم لێی بووەوە، چونکە بەرامبەر دایکم میهرەبان نەبوو. کاتێ دایکم نەخۆش کەوت و مرد، تێبینیم کرد زیاتر خەفەتبارترە لەوەی من بەو تەمەنە پازدە ساڵانەیەی خۆمەوە دەمتوانی خەفەتبار بم. ئیدی لەوە بەدوا نەمتوانی رقم لێی بێت.

ئێستا ئەوان هەردووکیان مردوون. هەر هەموو مردوون – هەموو ئەوانەی کە لە تافی منداڵیمدا دەهاتن و لەنێوان مۆبلەکاندا ڕادەوەستان. ئا، هەموویان نا، بەڵام ئەوانەی کە بۆ من شت بوون. ئێرنستی برام کە زۆر بەهێز و زۆر گێل و زۆر میهرەبانیش بوو، لە هەموو سەرچڵییەکانی قۆناخی ژیانی قوتابیەتیمدا لەسەری دەکردمەوە و پارێزگاریی لێ دەکردم، دوورکەوتووەتەوە. ئەو سەفەری بۆ ئۆستورالیا کرد، کەس نازانێ ماوە یاخۆ مردووە. ئالیسێی کچە جوانەکەی پوورم، کە ڕەنگپەڕیو و قیت لای پیانۆکەوە دادەنیشت و بە چاوانێکی خەواڵووەوە و بەدەنگێک کە مرۆڤی ئاگر تێ بەردەدا و دەیسووتاند، گۆرانیی دەگوت، بە تەرزێک گۆرانیی دەگوت کە من لە سەرمادا لەرزم لێ دەهات و لە حەژمەتا لە جامخانە گەورەکە لە قوژبنێکدا هەڵدەتروشکام، بە جۆرێک گۆرانیی دەگوت وەک ئەوەی ئیدی من بۆم نەبێ

گـوێ لە کـەسـی تـر بگرم گـۆرانـی بڵـێ، ئەدی ئەو چی بـەسـەرهـات؟ شـووی بە هەژاری کرد، شـووی بە مـامـۆسـتـای شـارێکی بچـووک کرد، پـیـاوێک کـە هـەر ئەوکات پیر و نەخـۆش و کەنەفت بوو. کـاتێ جـێژنی لەدایکبوونی ڕابردوو لای دایکـی بینیـم، لە ناکـاوێکرا کـوڵی گـریانم بەربوو، گـریانەکـەم دزەی کـردە ئەویشـەوە و ئیـدی دووقـۆڵی گـریاین... ئەدی ئاننای خـوشکی بـە کـوڵمـە هەڵایسـاوەکانییـەوە، ئەویش هەمان تای لە سەمـادا هەبوو کە خوشکەکەی لە گۆرانیـدا هەیبوو، ئەو لـە پیاوە سـەرسـەرییـەکەی خـۆی هەڵهات و چوو بۆ لای سـەرسـەرییـەکی تر و ئەمـیش دواجـار دەسـتـی لێ هەڵگرت. دەڵێن هـەنووکـە لە شیکاگۆ بە پارەی جەستەی دەژی. ئەدی باوکیـان، خاڵە ئیولریکی میهرەبان و قـۆز و گورجـوگـۆڵ کـە دەیانگوت لەو دەچم، بـەڵام من بە دیوە دزێوەکـەیدا لەو دەچووم، هـەمـان ئەو چارەنووسـەی کە باوکـمی تێک شکـاند، ئەویشـی لەتوپەت کرد و هـەروەک ئەویش لە نەبوونـیدا مرد... ئـەرێ ئەوە چ تاعوونێک بوو کـە لە ماوەی چـەند سـاڵێکی کـەمدا هـەمـوانی بەرەو گۆڕ یان بەرەو ژیانێکی تارمـایی لە بەدبەخـتیدا ڕاماڵی، هەمـوو، هەمـوو، هـەروەها زۆربـەی ئەو هـاوڕێیانەش کـە جاران لە ڕۆژانی ئاهەنگدا ژوورەکانمانیان لێ پڕ دەبوون؟

خوا دەزانێ ئەوە چی بوو، بەڵام هـەرهـەموویان بەسـەرچوون.

لانەی ماریێ س، هـەڵبەت ئێستا پێی دەگوترێ دارستانۆچکەی سۆفیێ.

## ١٠ی یولی

لای مێزەکەوە.

بە سـەرمـدا دێت دەست بەو سـپرینگەدا بنێم کە سندووقـە گچکە نهێنییـەکە دەکـاتەوە. هـەڵبەت دەزانم چیی تێدایە: تەنیـا قوتوویەکی گچکەی خڕ بە چەند دەنکە حـەپێکەوە. حـەز ناکەم لە دۆلابـی دەرمـانەکـانمدا بن، چونکـە بۆی هـەیە جـارێک لـەجـاران لە بنیـادەم تێکەڵ بن و ئەوەش شـتـێکی باش نیـیـە. چەند سـاڵێک لـەمـەوبـەر خـۆم ئەو حـەپانەم ئامـادە کـردوون و نـەخـتـێک

سیانکالیومیان(*) تێدایە. ئەوکاتەی ئامادەم کردن، هیچ خەیاڵێکی خۆکوشتنم لە سەردا نەبوو، بەڵام پێم وابوو کە مرۆڤی ئاقڵ دەبێ هەمیشە ئامادە بێت.

گەر مرۆڤ نەختێک سیانکالیوم بکاتە پەرداخێک شەراب یان شتێکی هاوشێوەی ئەوەوە، دەسبەجێ مردنی بەدوادا دێت، پەرداخەکەی لە دەست دەکەوێتە خوارەوە بۆ سەر ئەرزەکە، ئەمەش بۆ هەموو کەسێک ئاشکرایە کە ئەوەی ڕووی داوە خۆکوشتنە. ئەمە هەموو کاتێک باش نییە. لە بەرامبەردا ئەگەر کەسێک یەکێک لەم حەپانەی من بخوا و پەرداخێک ئاوی بەسەردا بکات، ئەوا دەقیقەیەک یان زیاتر دەخایەنێت تا حەپەکە لە لەشدا دەتوێتەوە و کاری خۆی دەکات، ئەوسا دەتوانێ بە هێمنی پەرداخەکە لەسەر سینییەکە دانێتەوە، بۆ خۆی لەسەر کورسییەکی ئیسراحەت لەبەر ئاگردانەکەدا دانیشێ، جگەرەیەک داگیرسێنێ و ڕۆژنامەی ئافتونبلادێت بخوێنێتەوە. ئیدی لە ناکاوێکڕا بەلادا دێت. پزیشک جەخت دەکاتەوە لەوەی کە ئەوە سەکتە بووە. لاشەکە توێکاری دەکرێت، ئەوسا هەڵبەت ژەهرەکە دەدۆزرێتەوە. بەڵام ئەگەر هیچ گومانێک لەسەر مردنەکە نەبێ یان لە گۆشەنیگای پزیشکییەوە چ هەلومەرجێکی جێ سەرنجی تایبەت نەیەتە پێشێ، ئەوا چ توێکارییەک بۆ لاشەکە ناکرێت. مرۆڤ ناتوانێ بڵێ هەلومەرجی ئاوها دێتەپێش، ئەگەر کەسێک لەکاتی خوێندنەوەی ڕۆژنامەی ئافتونبلادێتدا بەدەم کێشانی جگەرەی دوای شێوەوە سەکتە لێی دابێ.

هەڵبەت مایەی ئاسوودەیی و ئارامییە بزانم ئەم هەڵماتە گچکە ئاخنراو بە ئاردانە، کە لە تەرزەی قوڕقوشم دەچن، لەوێدان و چاوەڕێی ئەو ڕۆژە دەکەن کە مرۆڤ پێویستی پێیان دەبێ. هێزێک لەناوەوەیانڕا وەنەوز دەدا، بەش بەحاڵی خۆی شەڕانگێز و هەڕەشەکار، هەر لە خەلیقەتەوە دوژمنی سەرەکی مرۆڤ و هەموو شتێکی زیندووە. کاتێ بنیادەم ئەو هێزە ئازاد دەکات کە تاقە ئارەزووی تامەزرۆیی بێت بۆ خۆڕزگارکردن لە شتێکی خراپتر.

---

(*) cyankalium (Kaliumcyanid, KCN) ژەهرێکی کوشندەیە.

کاتێ ئەو هەڵماتە گچەکە ڕەشانەم بۆ خۆم دروست کردن، زیاتر بیرم لە چی دەکردەوە؟ هەرگیز نەمتوانیوە خۆکوشتن بەهۆی ئەڤینێکی ناکامەوە بهێنمە پێش چاوی خۆم. با شترە بڵێم بەهۆی هەژارییەوە. هەژاری ترسناکە. لە هەموو ئەوانەی پێیان دەگوترێت کارەساتی گەورە، هەڵبەت هەژاری قووڵتر کار لە ناخ دەکات. بەڵام پێ ناچێ بەڵایەکی وا لە منەوە نزیک بێت ، من بۆ خۆم، خۆم لەو کەسانە حیساب دەکەم کە بەختم باشترە و کۆمەڵناسان لە ریزی دەوڵەمەندانداندا دامانندەنێن. ئەوەی زیاتر بیرم لێ دەکردەوە هەڵبەت نەخۆشی بوو. نەخۆشییەکی درێژخایەن، بێ هەتوان و نەفرەتئامێز. هەڵبەت زۆرم بینیون... شێرپەنجە، گەزەنەک ، کوێری، ئیفلیجی... ژمارەیەکی زۆر خەڵکانی داماوم بینیون کە بەبێ هیچ دوودڵییەک یەکێک لەم حەپانەم پێ دەدان ئەگەر وەک هەر کەسێکی باشی تر خاوەن رێز و بایەخ نەبام بەرامبەر بە پۆلیس و یاسام نەخستبایەتە پێش بەزەیییەوە. لەبری ئەوە، چەند پەلوپۆی نەشیاو، نائومێد و ژاکاوی جەستەی مرۆڤم بە ناوی وەزیفەوە هەڵگرتوون و تەنانەت شەرمم لە وەرگرتنی هەقدەسیش نەکردووەتەوە.

نەریتەکە ئاوهایە. مرۆڤ هەمیشە ئاقلانە ڕەفتار دەکا گەر پێڕەوی نەریت بکات، لەو شتانەدا کە بە قووڵی وەک کەسیەتی نەمانهەژێنێ، دەشێ پەیڕەوی کردن لە نەریت شتێکی ڕاست بێت. ئەدی بۆچی من خۆم بکەمە شەهیدی تێگەیشتنێک کە درەنگ یان زوو دەبێتە تێگەیشتنی مرۆڤی شارستانی، بەڵام ئەمڕۆ ئەو تێگەیشتنە تاوانە؟ ئەو ڕۆژە دەبێ و پێویستە بێت کە مافی مردن وەک شتێکی زۆر گرنگتر و حاشا هەڵنەگرتر لە مافی مرۆڤ بە دانانی کاخەزێک بۆ ناو سندووقی دەنگدان بسەلمێنرێ، ئینجا تا ئەو ڕۆژە دێ، با هەموو نەخۆشییەکی بێ هەتوان و – هەروەها هەموو تاوانبارێکیش– خاوەن مافی یارمەتیدانی دوکتۆر بن، ئەگەر بیانەوێت ڕزگاربن.

شتێکی جوان و گەورە لەم جامی ژەهرەدا هەیە کە ئەسینییەکان لێگەڕان دوکتۆر بیداتە سوکرات، کاتێ گەیشتنە ئەو بڕوایەی ژیانی وی بۆ وڵات خەتەرە. ئەگەر لە سەردەمی ئێمەدا بە هەمان شێوە سزا درابایە ، ئەوا بە

پلاتفۆرمێکی پیسەوە دەبەسترایەوە و بە تەورێک سەری لە ملی جیا دەکرایەوە.

***

شەوباش ئەی هێزی شەڕانگێز. بنوو بە خۆشی لە قوتووە خڕە گچکەکەتدا. بنوو تا ئەو کاتەی پێویستم پێت دەبێ. ئەوەی تەواوێک پێوەندیی بە منەوە بێت، ئەوەیە کە لە ناوەختدا بێدارت ناکەمەوە. ئەمڕۆ باران دەبارێ، بەڵام ڕەنگ بێ سبەینێ خۆر پرشنگ بدات. ئینجا کاتێ ئەو ڕۆژە دێت کە پێم وایە خودی درەوشانەوەی خۆریش تاعوناوی دەبێت و نەخۆش دەکەوێت، ئیدی من دەسبەجێ بێدارت دەکەمەوە تا خۆم بنووم.

## ١١ی یولی

لای مێزەکەوە، رۆژێکی تەواو بێ هەتاو.

تازەکی لە یەکێک لە چەکمەجە گچکەکاندا پارچە کاخەزێکم دۆزیوەتەوە کە بە دەستخەتی من چەند وشەیەکی لەسەر نووسراوە، ئەوە لە ساڵانێکی زۆر لەمەوبەرەوەیە –لەبەرئەوەی دەستخەتی مرۆڤ بەردەوام گۆڕانکاریی بەسەردا دێت، هەموو ساڵێک نەختێک کە ڕەنگە مرۆڤ خۆی هەستی پێ نەکات، بەڵام بەهەمان ڕادە حەتمی و بێ ئەملاوئەو لا وەک ڕوخسار، راوەستان، جووڵە و ڕۆح.

لە کاخەزەکە نووسراوە:

"هیچ شتێک وەک ئەوە مرۆڤ سووک و بچووک ناکاتەوە، کە سوور بزانێت کەس عاشقی نییە".

کەنگێ ئەمەم نووسیوە؟ ئایا ئەمە کاردانەوەیەکی خۆمە یان سیتات(*) ێکە کە تۆمارم کردووە؟

بیرم نییە.

**

(*) citat: قسە هێنانەوە، قسە دەرهێنان لە کتێبێک. و. کوردی

له شکۆویستان تێ ناگەم. تەنیا پێویستم بەوەیە لە قوژبنێکدا لە ئۆپێراکە دانیشم و گوێ ڕادێرم بۆ مارشی تاج لەسەرنانی (پێغەمبەر)[*] تا هەست بە ئارەزوویەکی گەرم، بەڵام تێپەڕ بکەم بۆ دەسەڵاتداریەتیکردن بەسەر بەشەردا و لە کڵێسایەکی گەورەی دێریندا تاجم لەسەر بنرێت.

بەڵام دەبێت ئەوە ئەو کاتە بێت کە زیندووم و لێ گەڕێ با پاشی ئەوە بێدەنگی بێت. هەرگیز لەو کەسانە حاڵی نەبووم کە بە دوای ناوێکی نەمردا ڕاکەڕاکیانە. زەینی مرۆڤایەتی کەموکورت و ناهەقە، ئێمە دێرینترین و گەورەترین چاکەخوازانمان لەبیرکردوون. کێ گالیسکەی داهێنا؟ پاسکال فەرخونی داهێنا و فیولتۆنیش لۆکۆمۆتیڤ[**]، بەڵام کێ گالیسکەی داهێنا. کەس نازانێ. لەبری ئەوە مێژوو ناوی گالیسکەچییەکەی شا خێرخێس، پاتیرامفێسی کوڕی ئۆتانێسی تۆمارکردووە. ئەو گالیسکە گەورەکەی پادشای دەئاژاوت. ئەو دەبەنگە هیچ نەزانەش کە لە ئێفێسیۆس[***] ئاگری لە پەرستگای دیانا بەردا تا خەڵکی ناوی لەبیر نەکەن، تەواوێک بە ئامانجی خۆی گەیی و ناوی لە بروکهاوس[****] دا هاتووە.

**

---

(*) Profeten: ئۆپێرایەکی Jacob Beer بە لیبرتۆ (تێکستی ئۆپێرا)ی Eugene Scribleەوە، یەکەمین نواندنی لە ساڵی ١٨٤٩دا کراوە و لە ستۆکهۆڵمیش لە ساڵی ١٨٥٢دا پێشکەش کراوە. و. کوردی.

(**) Lokomotiv: ئەو بەشەی شەمەندەفەر کە مۆتۆرەکەی تێدایە و واگۆنەکان بەدوای خۆیدا رادەکێشێت. و. کوردی

(***) Efesus: لە کۆندا شارێکی بازرگانیی گەورە بووە و هەنووکەش گوندێکی هاکەزاییە لە ئاسیای بچووک. پەرستگەکەی بەیەکێک لە حەوت جێگە سەرسوڕهێنەکانی دنیا دانراوە. ساڵی ٢٦٣ زاینی ئەو پەرستگەیە سووتێنراوە. و. کوردی.

(****) Brockhaus: فریدریش ئارنۆلد ١٧٧٢–١٨٢٣ لە ساڵی ١٨١٧دا چاپخانەی بوکهاوسی لە لایپزیگ دامەزراند، کە بەناوبانگە بەفەرهەنگەکەی. و. کوردی

مرۆڤ دەیەوێ خۆش بویسترێت، پاشان لە کەماسیی عیشقدا دەیەوێت ستایش بکرێت، پاشان لەکەماسیی ستایشدا دەترسێت، پاشان لە کەماسیی ترسدا ڕقی بەرامبەر دەوروژێ و سووکایەتیی پێ دەکرێت. مرۆڤ حەز دەکات جۆرێک هەست لە مرۆڤەکاندا بوروژێنێت. رۆح لە پانتاییــیە بۆشــەکان ڕادەپەڕێ و دەیەوێ بەهەر نرخێک بووە پێوەندی دروست بکات.

## ١٣ی یولی

ڕۆژانێکی خەمین و ساتگەلێکی ڕەشم هەن. من بەختەوەر نیم. لەگەڵ ئەوەشدا کەس ناناسم بخوازم شوێنەکەمی لەگەڵدا بگۆڕمەوە، دڵم دەگوشرێ کاتێ ئەوە دەهێنمە بەرچاوی خۆم کە بتوانم لە جێگەی فلان و فیسار کەس بم لە ناسیاوەکانم. نەء، من نامەوێت کەسێکی تر بم.

لە بەراییی گەنجیمدا ئازارێکی زۆرم بەوەوە دەچەشت کە جوان نەبووم، کە حەزێکی هەلایساوم بۆ جوانبوون هەبوو، پێم وابوو دەعبایەکم لە دزێوی. هەنووکە دەزانم من تا ڕادەیەک وەک زۆربەی خەڵکانی تر وام، ئەمەش شتێکە شادمانم ناکات.

من زۆر خــۆمم خــۆش ناوێت، نە ڕووکــاری دەرەوەم و نە ناوەوەم. بەڵام نامەوێت کەسێکی تر بم.

## ١٤ی یولی

بەرەکەتت لێ بێ ئەی خۆر کە دەتوانیت لە خوارەوە، هەتا لە گۆڕەکانی ژێر درەختەکانیشدا بە دواماندا بگەڕێیت...

بەڵێ، تازەکی هەتاو بوو، ئێستا تاریکە. لە پیاسەی ئێوارانم هاتوومەتەوە. شار وەک ئەستێرێک لە سوورەگوڵدا ڕاکشاو و تەمێکی تەنکی گوڵگوڵی بەرزاییەکانی باشووری گرتبووەوە.

بۆ ساتێک لە مێزێکی کەنار شۆستەکەی دەرەوەی گراندا دانیشتم و نەختێک خواردنەوەی شیرین بە لیمۆم خواردەوە، خاتوو مێرتێنس لەوێوە تێ پەڕی. هەستام و سڵاوم لێ کرد، ئەوەی بۆ من مایەی کتوپڕی بوو ئەوە بوو کە ڕاوەستا، دەستی بۆ ڕایەڵ کردم و بەر لەوەی بڕوات چەند وشەیەکی لەبارەی نەخۆشییەکەی دایکی و ئەو ئێوارە جوانەوە گوت. کاتێ قسانی دەکرد سوور هەڵگەڕا، وەک ئەوەی هەست بەوە بکات کە ئەوەی ئەو کردوویەتی شتێکی نائاساییە و دەکرێ بە هەڵە لێک بدرێتەوە.

بەهەر شێوەیەک بێت من ئێستا ئەو هەڵوێستەی ئەو بە هەڵە لێک نادەمەوە. هەڵبەت من زۆر کەڕەت ئەوم بینیوە کە مامەڵەی تا ڕادەیەک بەرامبەر هەموان چ نەرم و میهرەبان و خاڵی بووە لەهەر جۆرە ڕەسمیاتێک، ئەمەش شتێک بووە هەمیشە ئەفسوونی کردووم.

بەڵام بەهەرحاڵ - چ درەوشانەوەیەکی هەبوو، بڵێی عاشقی کەسێک بێ؟

خێزانەکەی یەکێک بوو لەو خێزانە زۆرانەی کە عەزابیان بەدەست تێکشکانی باوکمەوە چەشت. لەو ساڵانەی دواییدا خاتوونی پیری سەرهەنگ نەخۆش کەوت و زوو زوو سەردانی دەکردم. هەرگیز قایل نەبووم هەقدەسیان لێ وەربگرم، هەڵبەت هۆکەیان دەزانی.

ئەو ئەسپسوارییش دەکات، بەو دواییە چەند جارێک لە ئەسپسوارییەکانی بەیانیانمدا بینیومە، دوایین جار دوێنێ بوو. بە گوتنی (بەیانی باش)ێکی شادمانانە بەڕیتمێکی خێرا بەلامدا تێ پەڕی، پاشان بینیم لە پێچی ڕێگاکەدا خاوی کردەوە و کەوتە نەرمە لۆقە و مەودایەکی درێژ بە جڵەوی شلەوە وەک ئەوەی لە خەوندا دەبینرێت، ئەسپەکەی غار پێ دا... بەڵام من لەسەر ڕیتمە یەکسانەکەی خۆم بووم، بەو شێوەیە لە ماوەیەکی کەمدا چەند جارێک بەلای یەکدیدا تێ پەڕین.

**

لەڕاستیدا ئەو جوان نییە، بەڵام شتێکی تێدایە تەواوێک بە شێوەیەکی

تایبەتی لەگەڵ ئەوەدا دێتەوە، کە ساڵانێکی زۆرە و تا ئەم دواییانەش خەونی من بووە لەبارەی ژنەوە. شتێک کە ناتوانرێت ڕاڤە بکرێت.. جارێکیان – ئێستا دەکاتە دوو سێ ساڵێک لەمەوبەر– بە زەحمەتێکی زۆر توانیم ئەوە ڕێک بخەم تا بۆ ماڵێک داوەت بکرێم کە دەمزانی ئەو هامشۆیان دەکا، تەنیا بۆ ئەوەی بیبینم. ئەویش ڕێک هات بۆ ئەوێ، بەڵام ئەو جارەیان بە حاڵ منی بینی و نەمانتوانی قسەی زۆر پێکەوە بکەین.

ئێستایش ئەو باش دەناسمەوە، ئەو هەمان کەسەکەی ئەوسایە. ئەوەی کە چی دی نایناسمەوە خۆمم.

## ١٧ی یولی

نا، هەندێ جار پێم وایە ڕوخساری ژیان ئێجگار دزێو خۆ دەنوێنێ.

تازەکی لە سەردانێکی شەوانەی نەخۆشێکم گەڕاومەتەوە. لە زەنگێکی تەلەفۆنەکە بێداربوومەوە، ناو و ئەدرێسەکەیم وەرگرت – هەر زۆر نزیک بوو– کورتەیەکیش لەبارەی مەسەلەکەوە: منداڵێک کوتوپڕ بە شێوەیەکی قورس نەخۆش کەوتووە، ڕەنگ بێ گەرووی هەوی کردبێ، ماڵی فلانی جوملەفرۆش. دەورە درابووم بە شەوگەڕانی سەرخۆش و سۆزانی کە پاڵتۆکەیان ڕادەکێشام، بە جادەکاندا بە پەلە دەڕۆیشتم. ماڵەکە لە نهۆمی چوارەم و لە شەقامێکی فەرعیدا بوو. هەستم کرد ئەو ناوەی لە تەلەفۆنەکەدا بیستم و ئەو ناوەش کە ئێستا لەسەر دەرگاکە دەیخوێنمەوە، ناسیاوە، بەبێ ئەوەی بزانم لە کوێوە ناسیاوی یەکدین. لەلایەن خانمێکەوە بە کراسی خەو و ژێر تەنوورەیەکەوە پێشوازی کرام – خاتوونەکەی یورگۆردسبریون بوو، کە جارێکیان لە ساڵانێکی زۆر لەمەوبەرەوە ناسیبووم–. لە فیکرەوە چووم: کەواتە کوڕە گچکە جوانکیلەکەیە. لەمیانەی هۆڵێکی تەسکی نانخواردن و ڕاڕەوێکی گەوجانەوە، کە بە شێوەیەکی کاتی بە لەمپایەکی نەوتاوی موبەق ڕووناک کرابووەوە و لە سوچی ڕەفەیەکدا دانرابوو، بەرەو ژووری نووستن

برام، کە دیاربوو ژووری نووستنی هەموو خێزانەکە بوو. هەڵبەت پیاوەکەم نەبینی، لە ماڵ نەبوو. خاتوونەکە گوتی: "ئەوە کوڕە گەورەکەمانە کە نەخۆشە". بردرامە پێشەوە بۆ لای سیسەمێکی گچکە. کوڕە گچکە جوانکیلەکەی تێدا نەبوو، بگرە یەکێکی تر بوو، دەعبایەک بوو بۆ خۆی. شەویلگەی زەبەلاحی مەیمونئاسا، کاسەسەری قوپاو، چاوانی گچکە و شەڕانگێزانە و سست. هەر لەیەکەم بینینەوە دەردەکەوت کە: دەبەنگێکە.

ئێ – کەواتە ئەمە نۆبەرەکەیە. ئەمە ئەوەیانە کە ئەو جارە لە ژێر دڵیدا هەڵی گرتبوو. ئەمە ئەو بوونەوەرە بوو کە دایکی کەوتە سەر چۆک و لێم پاڕایەوە تا لەکۆڵی بکەمەوە و منیش بە مەسەلەی وەزیفە وەڵامیم دایەوە. هێی ژیان، من تێت ناگەم!

ئێستاش دواجار مردن دەیەوێت باڵی ڕەحمەت بەسەر ئەم و ئەواندا بکێشێ و لەو ژیانە هەڵی بگرێت کە ئەم هەرگیز نەدەبوو بێتە ناوییەوە. بەڵام دەستی بەو ڕەحمەتە ڕاناگات! ئەوان جگە لەوەی کە لێی ڕزگاربن هیچی تریان ناوێت، هەڵبەت جگە لەمەش چ چارەیەکی تر نییە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش لە قوڵاییی دڵی ترسنۆکیانەوە دەنێرن بە دوامدا، بە دوای منی دوکتۆردا، تا بەشکم مردنی میهرەبان و بە بەزەیی لێ دووربخەمەوە و ئەم دەعبایە لە ژیاندا بهێڵمەوە. منیش بە هەمان ترسنۆکیی گەورەوە، بە "وەزیفەی خۆم" هەڵدەستم و هەمان ئەو شتە دەکەم کە ئەوساش کردم.

هەڵبەت من دەسبەجێ کە خەواڵوو لەو ژوورە غەریبەیەدا، لەلای تەختی نەخۆشەکەوە ڕاوەستابووم، ئەم هەموو خایلەیەم بۆ نەهات. من تەنیا خەریکی کاری خۆم بووم و بیرم لە هیچ نەدەکردەوە – تا ئەو شوێنەی کە پێویست بوو مامەوە، ئەوەی کە پێویست بێ بکرێ کردم و ئیدی ڕۆیشتم. لە شوێنی هەڵواسینی پاڵتۆ و جلی سەرەوەدا باوک و پیاوەکەم بینی کە لەوکاتەدا دەهاتەوە ماڵەوە و کەمێک سەرخۆش بوو.

**

کوڕە مەیموونیش دەژی – ڕەنگە بۆ ساڵانێکی زۆر.

ئەو ڕوخساره ترسناکە ئاژەڵئاسایە بە چاوە گچکە شەرانگێزە سستەکانییەوە تا ئێرە بۆ ژوورەکەم بە دوامەوە بوو، دادەنیشم و هەموو چیرۆکەکە لەو چاوانەدا دەخوێنمەوە.

ڕێک بووەتە خاوەنی ئەو چاوانەی کە کاتێ ئەمی بە بەرەوە بوو، دایکی دونیای پێ دەبینی. بە هەمان چاوانیشەوە جیهان دایکی فریودا، کە خۆی هەمان ئەو شتە ببینێ کە کردوویەتی.

دەی ئێستا ئەمەش بەرەکەیە – بنۆڕە چ بەرێکی جوانە!

باوکی دڵرەق کە لێی داوە، دایکی بە سەرێکەوە پڕ لە قسە و قسەڵۆکی خزم و ناسیاوان، کارەکەران کە لەژێر پەرچەمەوە تەماشایان کردووە و تلیقاونەتەوە و لە دڵەوە شادمان بوون بەوەی سەلماندنێکی دیاریان دەس کەوتووە کە "باش"ەکان لە خراپەکان باشتر نین، پوور و مام بە ڕوخسارگەلێکی وشک هەڵگەڕاو بە تاوانکاریی گێلانە و مۆراڵی گێلانە. قەشە لە کورتی و وشک ئەم هاوسەرگرییە شەرمەزارانەیەی بڕیوەتەوە، بە جۆرێک لە حەق و ڕەنگە بە کەمێک شەرمەوە لەوەی کە بە ناوی خوامانەوە هەردوو لایەن هان بدا بۆ کردنی شتێک کە دیارە پێشتر کراوە – هەمووان بەشێکیان لەو بەزمەدا هەبووە، هەمووان بەشێکیان لەوەدا هەبووە کە ڕووی دابوو. تەنانەت دوکتۆرەکەش لەوە بێ بەری نەبووە– دوکتۆرەکەش خۆم بووم.

هەڵبەت دەمتوانی ئەو جارە یارمەتی بدەم کە لەوپەڕی تەنگانە و نائومێدیدا لەم ژوورەدا کەوتە سەر چۆک. لەبری ئەوە من بە وەزیفە، کە خۆم باوەڕم پێی نەبوو، وەڵامم دایەوە.

بەڵام خۆ نەدەمتوانی و نەدەشمزانی یان مەزەندەم دەکرد کە…

هەڵبەت مەسەلەکەی ئەو یەکێک بوو لەوانەی کە هەستم دەکرد دڵنیام. گەر باوەڕم بە "ئەرک" نەبوایە – باوەڕم بەوە نەبوایە ئەمە لە سەرروو هەموو یاسایەکی زۆرەکییەوەیە کە خۆی هێناوەتە دەرەوە تا هەبێت– ئەوسا زۆر بە

ئاشکرا لێم دیار دەبوو شتێکی ڕاست و ئاقڵانە لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە ئەو شتە بکرێت، کە خەڵکانی تر پێی دەڵێن وەزیفە. دەی منیش بێ هیچ دوودڵییەک ئەوەم کرد.

ئەی ژیان، من تێت ناگەم.

**

"کاتێ منداڵێک بە شێواوی لەدایک دەبێت، دەیخنکێنن".

(سێنێکا)

**

خەرجی ساڵانەی هەر دەبەنگێک لە خانەی ئیوگێنیا، لە داهاتی ساڵانەی کرێکارێکی گەنجی لەشساغ زیاترە.

## ٢٤ی یولی

هەمدیس گەرمای ئەفریقا هاتەوە. بە درێژایی پاش نیوەڕۆ وەک دوکەڵێک لە تۆزی ئاڵتون لە هەوایەکی ئەوقی قورسدا بەسەر شارەوە بوو ، لەگەڵ خۆرئاوابووندا فێنکی کرد و باشتر بوو.

تا ڕادەیەک هەموو ئێوارانێک بۆ ساتێک لە گوێ شۆستەکەی دەرەوەی گراند دادەنیشم و خواردنەوەیەکی سووکی بە لیمۆ، بە قامیشێکی باریک دەمژم. حەزم لەو ساتەوەختەیە کە چراکان بە درێژایی پێچەکانی گوێ ڕووبارەکە دادەگیرسێن، ئەوە خۆشترین سەعاتی ڕۆژەکەمە. بەزۆری بە تەنیا دادەنیشم، بەڵام دوێنێ لەگەڵ بیرک و مارکێلدا دانیشتم.

مارکێل گوتی: سوپاسی خوا دەکەم کە هەمدیس کەوتوونەتەوە داگیرساندنی گڵۆپەکان. من بەبێ گڵۆپ خۆم لێرە لەم تاریکاییانەی هاویندا ناناسمەوە کە ماوەیەکی باش سەرگەردان تیایدا هاتین و چووین. گەرچی دەزانم ئەم بەرنامەیە تەنیا و تەنیا بەهۆی پاشەکەوتەوەیە، واتە بەهۆی موتیڤێکی تەواو شایانەوەیە، بەڵام بەهەرحاڵ تامێکی سادەی ناخۆشی دەبێت

گەر بگوترێ بۆ تامی گەشتیاری ڕێک خراوە. نیوەشەوانی وڵاتی هەتاو – نەفرەتتان لێ بێ.

بیریک گوتی: ئا، دەکرێ لانی کەم ڕازی بن بەوەی کە لە ناوەڕاستی هاویندا دوو سێ شەوێک گڵۆپەکان بکوژێننەوە، چونکە هەر بەڕاستی لەو کاتانەدا دنیا وەک رۆژ ڕووناکە. لە لادێ ئاوابوونی خۆر لە هاویندا شتێکی تەواو ئەفسوناوییە، بەڵام لێرە وا نییە. داگیرساندنی گڵۆپ هی ئێرەیە. هەرگیز وەک ئەو جارەی ئێوارەی پایزێکیان ئاوها بەهێز هەستم بە بەختەوەری و شانازی لە شاردابووندا نەکردووە، کە بە منداڵی لە گوندەوە هاتم و بینیم گڵۆپەکانی دەوری لەنگەرگاکە داگیرساون. بیرم کردەوە دەبێ ئێستا ئەو نەگبەتانەی گوند خۆیان خزاندبێتە کوختەکانیانەوە یان بەو ناوەدا هەنگاوە لۆقە بەنێو تاریکی و پیسیدا بنێن.

ئینجا درێژەی دایێ: بەڵام ئەوە ڕاستە کە لەبری ئەوە مرۆڤ لە گوند ئەستێرەی ئاسمانی جیاواز لە ئەستێرەی ئاسمانی ئێرەی هەیە. لێرە ئەستێرەکان لە پێشبڕکێدان لەگەڵ چرای گازیدا، تیا دەچن. دەی ئەمەش حەیفە.

مارکێل گوتی: ئەستێرەکان توانای ئەوەیان نییە لە هامشۆ سەرگەردانەکانی شەوانماندا ڕووناکمان بکەنەوە. مایەی خەفەتە کە تا چ پلەیەک مانای کردەیی خۆیان لەدەست داوە. پێشان هەموو ژیانی ئێمەیان ڕێسابەندی کردبوو، هەر کاتێ مرۆڤ ڕۆژمێرێکی هاکەزاییی پەنجا قڕانی دەکردەوە، دەیتوانی باوەڕ بکا کە هێشتا ئەستێرەکان هەمان ڕۆڵ دەبینن. زەحمەتە نموونەیەکی لەمە نیشانەپێکتر زیاتر لەبارەی سەرسەختیی تradیشون بهێنرێتەوە کە بڵاوترین کتێبی کولتوور پڕە لە زانیاری ورد لەبارەی شتگەلێکەوە کە چیدی مرۆڤ پێی گرنگ نین. هەموو ئەو ئاماژە ئەستێرەناسییانەی کە هەژارترین جوتیار دوو سەد ساڵ لەمەوبەر کەم و زۆر تێیان دەگەیشت و بە حەز و بە هەوڵەوە دەیخوێندنەوە و باوەڕی وابوو کە خۆشیی ژیانی بەهۆی ئەوانەوەیە، کەچی ئەمڕۆ بۆ زۆرێک لە خوێنەواران

شـتـی نائاشنـا و قـابیلـی تێگـەیشتن نین. ئەگـەر ئەکـادیمیـای زانست رۆحی گاڵتەی هەبایە، ئەوا دەیتوانی بەوە خۆی سـەرگەرم بکات کە دووپشک و شێر و پاکـیژە لە ڕۆژژمـێـرەکەدا وەک یانسیب لە کـلاوێکدا تێکەڵاو بکا، خـەڵکی سـەرنجی یەک زەڕە شـتـیـان نەدەدا. ئەسـتـێـرەکـانی ئاسـمـان تەواوێک دابەزێنراون و ڕۆڵێکی دیکۆریانەیان پێ دراوە.

قومێکی لە بادە تێکەڵ بە ساردییەکەی دا و بەردەوام بوو:

– نەء، چی دی ئەسـتـێرەکـان ناتوانن بـەوە دڵخـۆش بن کـە وەک جـاران لە جـیـهـاندا هەمـان نـاوبانگیـان هەیە. تـا ئەو جـێگا یەی کـە مـرۆڤ پێی وابوو چارەنووسـی پێـیـانەوە گـرێ دراوە، ئەوا لێـیـان دەترسـا، بەڵام خـۆشـیـشـی دەویستن و دەشیپەرستن. ئێمە هەمـوومان بە منداڵی زۆرمان خۆش ویسـتوون لەو بڕوایەوەی ئـەوانە چرای بچکۆلانـە و جـوانـن کـــە خـــوا شـــەوانـە دایان دەگیـرسێنێ تا شـادمـانمان بکا و ئـێمـەش مـەزەندەمـان دەکرد ئـەوانە لەبەر ئێـمـەیە وا پرشنگ دەدەن. ئێـسـتـا هەمـدیس، کە شـتـێک زیاتریـان لەبارەوە دەزانین، بۆ ئێـمـە تـەنیـا یادەوەرییـەکی هەمـیـشـەیی و بەسـۆ و بێ چاوەڕوون لەبارەی بێ مـانـایی ئێـمـەوە. بۆ نموونە شـەوێک لە شـەوان پیاوێک بە جـادەی درۆتنینـدا دەڕوا و بیـــری چاک و نـایاب، ئا... بیـــری ســـەردەم دروســـتکەر دەکاتەوە، بیرێک دەکاتەوە کە مرۆڤ هەست دەکات هیچ کەسێکی تر لە دنیادا نەیتـوانیـوە یان نەیوێراوە بیکاتەوە. لێ گـەڕێ ئەزمـوونێکی چەندین سـاڵە لە قـووڵاییی منی نائاگاییمـاندا خـۆ مەڵاس بدا و بچرپێنێ کە ئێمە بۆ سبەینێ بەبێ هیچ دوودڵیـیـەک یان ئەم بیـرانەمـان بیـر دەچنەوە یاخـۆ چی دی چ نیگایەک لە چاکی و سـەردەم رۆنەریان تێدا نابینین – قـەیدی ناکـات، تا ئەو مـەسـتـیی بیرکردنـەوەیە هەبێت، بەختـەوەری کـەم ناکـات. بەڵام مـرۆڤ تەنیـا هێندەی بەسـە سـەر هەڵبـڕێ و ئەسـتـێرەیەکی گـچکە ببـینێ کـە تەواوێک نەبزووت لەنێوان دوو دووکەڵکێشی تەنەکەدا دیارە و دەدرەوشێتەوە و پرشنگ دەدا، ئەوسـا مـرۆڤ تـێ دەگـا باشـتـرە دەسـبـەجـێ هەمـوو ئـەو خـایلانـە لە بیربکات. یان مرۆڤ دەڕوا و لە ئاوەڕۆی جادە دەنۆڕێ و لە فیکرەوە دەچێ کە

ئەگــەر هەر بە ڕاسـتـی تەواوێک تا بەلادا هـاتن بیـخــواردبایەوە ، یان ئـەگـەر ڕەنگە بیتوانیبـا شتێکی باشتری دۆزیبایەتەوە کـاتـی پـێ بەسـەر بەرێت. ئـەوسا مـرۆڤ کـوتوپـڕ ڕادەوەسـتـێ – هـەر لـەم شـەوانـەدا بـەسـەر خـۆمـدا هـاتووە– لە خاڵێکی گچکەی داگیرساو لە ئاوەڕۆی جادەکەدا زەق دەبێتـەوە. مرۆڤ دوای سـاتێک پێـچـەوانـەبوونـەوە بـۆی سـاغ دەبێـتـەوە کـە ئـەوە ئەسـتـێـرەیەکـە و لە ئاوەکەدا عـەکس بووەتەوە – دەنا ئەوەی من بینیم کلک بوو بە قـووەوە. ئیدی دەستوبرد ئـاشکرا دەبێت کـە هـەموو مـەسـەلەکە چەنـد گاڵتـەجاڕانە بێ بایەخ دەردەکەوێت.

مـۆڵەتم بە خـۆم دا قـسـەیەک دەرپەڕێنم: "بـاشـە، ڕاسـتـە ئێـسـتـا مـرۆڤ دەتوانێت بەوە بڵێت ڕوانین لە مـەستیی لەژێر گۆشـەنیگای ئەبەدییـەتدا . بەڵام بەحـاڵ ئـەوە شـتـێکی تەواو سـروشـتـیـیـە بۆ ئێمـە لە ڕەوشـێکی هۆشـیـاردا و بەهـەرحـاڵ بۆ بەکاربردنێکی ڕۆژانەیی ناگونجێت. گەر لـەو سـەردەمـەدا ڕووی دابا کـە ئەسـتـێرەی دینب خـۆی وەک نیمچـە ئەسـتـێرەی فـەرعی بینیبـا ، ئـەوا ڕەنگە خـۆی ئێـجـگـار بێ مـانا بینیـبـا کـە مـەزەندە بکا ئـەو ئازایەتیـیـە ئـەوە دەهێنێ کە چی دی پرشنگ بدا . هەرچۆنێک بێ لە ماوەیەکی زۆر لـەمەوبەرەوە ئەو ئەستێرەیە لە گۆڕەپانەکەدا لە پۆستـەکەی خۆیدا دانیشتـووە و زۆر جوان پرشنگ دەدات، لە هـەردوو جـیـهـانـی زەریای کـەوکـەبە نـائاشناکـان کـە ئـەم ئەسـتـێـرەیە خـۆریانـە و جـارێکیش لە ئاوەڕۆی جـادەیەکی ئەرزە گـچـکە تاریکەکەدا ، خۆی پێچـەوانە دەکاتەوە. هـاوڕێی ئازیز، لە نموونەکە ورد بەرەوە! بەڵێ، من مـەبەسـتم لـە گـەورە و تەواوەکـە و لە نزیکەییـیـەکـەیە، نەک تـەنیـا سەبارەت بە ئاوەڕۆی جادەکە".

بیریک بە پەلە گوتی: "گەر مارکێل بڕوای وایە کە تەنانەت دەتوانێ کەمترین و لاوازترین شـتـێک لە بادە تێکەڵ بە سـاردییـەکـەیدا ، لە گـۆشـەنیگای ئەبەدییـەتەوە تەمـاشـا بکات، ئەوا مـەودا لە خـایلەکەیدا زۆر بـەرز ڕادەگرێت. شـتـێکی ئاوها لە توانای ئەودا نییـە و ناتوانێ بە زیندوویی لـەوە بێتـە دەرێ. پێمـوایە لە شـوێنێکدا خـوێندوومـەتەوە کـە ئەو شـێوە بینینە لە گۆشـەنیگای

ئەبەدییەتەوە تەنیا و تەنیا ئیمتیازی خوایە. ڕەنگە لەبەر ئەمەش بێت کە لەوە بووەتەوە بوونی هەبێت. بە دڵنیاییەوە ڕەچەتەکە هەتا بۆ ئەویش زۆر قورسە".

مارکێل بێدەنگ بوو. جیدی و خەمین دەینواند. لانی کەم کە لەو تاریکاییەدا و لەژێر سایبانە سوورە خەتخەتەکەدا، دەمتوانی ڕوخساری ببینم، وا دەینواند، هەروا کە دەنکە شقارتەکەی ڕاکێشا تا سیگارە کوژاوەکەی داگیرسێنێتەوە، هەستم کرد پیر بووە. لە فیکرەوە چووم کە ئەو لەنێوان چل و پەنجاساڵیدا دەمرێت. دەنا ئەو بە دڵنیاییەوە بڕێکی باشی لە چل تێ پەڕاندووە.

بیرک کە بە شێوەیەک دانیشتبوو دەیتوانی شۆستەکە بە ئاڕاستەی شار ببینێت، لەناکاوێکرا گوتی:

– خاتوو گریگۆریۆسی ژنی ئەو قەشە نەفرەتییە وا لە دوورەوە دێ. خوا دەزانێ کە چۆن بۆ قەشە بە گیر هاتووە. کاتێ مرۆڤ ئەو دوانە پێکەوە دەبینێت، ئەوا دەبێت ڕوو وەرگێڕێت، بنیادەم هەستێکی وای لا دروست دەبێت کە ساکارترین ڕێسای دراوسێیەتی بەرامبەر ئەو ژنە، ئەوە دەخوازێت.

پرسیم: ئایا قەشەی لەگەڵدایە؟

– نا، بە تەنیایە...

ئا وایە، خۆ قەشە هێشتا لە پورلایە.

بیرک گوتی: "پێم وایە کە ئەو لە دیلیلا(*) یەکی قژکاڵ دەچێت".

میراکێل: لێ گەڕێن ئومێد بخوازین کە ئەو ئەرکەکانی لە ژیاندا بە باشی بزانێ و خیانەت لە مەولای ناسیری بکات.

بیرک: من ئەوە بە دوور دەزانم. هەڵبەت ئەو کەسێکی ئایندارە. بە پێچەوانەی ئەوەوە هاوسەرگرییەکە شتێکە ڕاڤە هەڵناگرێت.

---

(*) Delila: ئەو ژنە فیلیستییە (ئیسرائیلییە) دڵڕفێنەیە کە نهێنییەکەی سیمسۆن هەڵدەهێنێ.

مارکێل: بەگوێرەی تێگەیشتنی سادەی من بە پێچەوانەوە، ڕاڤەنەکردوو دەبوو گەر دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی گونجاو بەسەر شووکردنیدا بە قەشە گریگۆریۆس، شتێکی زۆر کەم لە ئاینی لەخۆیدا پاراستبا. بەهەرحاڵ ناکرێت ئەو لە مادام دی ماینتێنون ئایندارتر بێت. ئیمانی ڕاستەقینە یارمەتییەکی بە بەهایە لە هەموو پێوەندییەکانی ژیاندا و هەرگیز نەبووەتە کۆسپ لەبەردەم جووڵەدا.

کاتێ بەلاماندا تێپەڕی بە ئاڕاستەی مۆزەخانە و شێپهۆلدا، ئێمە بێدەنگ بووین. ئەو جلکێکی سادەی ڕەشی لەبەردا بوو. نە خاو دەڕۆیشت و نە خێرا و نە تەماشای ڕاستی دەکرد و نە چەپ.

بەڵێ، ڕۆیشتنی ئەو... کاتێ ئەو تێ پەڕی من دەبوو بە ناچاری چاوانم لێک بنێم. ڕۆیشتنەکەی لە ڕۆیشتنی کەسێک دەچوو بەرەو چارەنووسی خۆی بچێت. دەڕۆیشت و کەمێک سەری داگرتبوو بە شێوەیەک کە نەختێک لە گەردنی لە ژێر قژە زەردەکەی پشت ملیدا بە ڕەنگێکی سپی پرشنگی دەدا. ئایا زەردەخەنەی دەهاتێ؟ نازانم. لە ناکاوێکڕا خەونەکەی ئەو شەوەمم بیرکەوتەوە. هەمان ئەو تەرزە زەردەخەنەیەی هەبوو کە لە خەونە ترسناکەکەی ئەو شەوەدا لەسەر لێوی بوو، من هەرگیز ئەوم نەبینیوە لە واقیعدا زەردەخەنە لەسەر لێوی بێت و ناشمەوێ هەرگیز ئەو زەردەخەنەیە ببینم.

کاتێ سەرم بەرزکردەوە و هەمدیس تەماشام کرد، بینیم "کلاس ڕێکێ"ش بەرەو هەمان ئاڕاستە لەوێوە تێ پەڕی. لەسەر شۆستەکەوە سەرێکی بۆ بیرک و مێرکێل لەقاند، ڕەنگە سەری بۆ منیش لەقاندبێ، ئەوەم پێ کەمێک نادیار بوو. مارکێل ژێستێکی بۆ کرد تا بێت و لەگەڵماندا دانیشێت، بەڵام ئەو لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو، بەبێ ئەوەی وا خۆی پیشان بدات کە ئاگای لە خولقکردنەکەی مارکێل بووە. بەهەمان شوێنپێی خاتوو گریگۆریۆسدا ڕۆیشت. من پێم وابوو  دەستێکی بەهێز دەبینم کە بەهەمان دەزووی نەبینراو هەردووکیانی گرتووە و بەرەو هەمان ئاڕاستە ڕایان دەکێشێت. لە خۆمم پرسی: دەبێ ڕێگەکەیان بەچی کۆتایی بێت؟ ئۆە، بەڵام ئەوە بە من چی! ئەو

ڕێگایەی ئێستا ئەو خاتوونەی پێدا دەڕوات، بەبێ یارمەتی منیش هەر پیایدا دەڕۆیشت. من تەنیا نەختێک لە خۆڵ و خاشاکە درێوترینەکەم لەبەر پێ و پلە گچکەکانیدا ڕامالّیوە. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگاکەی سەختە و هەر دەبێت واش بێت. جیهان لەگەڵ ئاشقاندا میهرەبان نییە. دواجاریش هەمیشە ڕێگەی ئەوان و ئێمەیش هەر بە تاریکی کۆتایی دێت.

مارکێل گوتی: بەم دوایییە بە زەحمەت ڕێکێ گیردەکەوێت. من دڵنیام کە ئەم سەرسەرییە شتێکی تایبەتی لەبن سەردایە. بیستوومە دەڵێن سەردانی کیژێکی گچکەی پارەدار دەکات. بەڵێ، بەڵێ، دواجار دەبێ بچێتە سەر ئەو ڕێگەیە، ئەو وەک شازادەیەک قەرزدارە، بووەتە دیلی دەست سووخۆران.

ڕەنگ بێ بە کەمێک تووڕەیی بێ پاساوەوە پرسیبم: "چۆن ئەمەت زانی؟ "

بێ شەرمانە وەلاّمی دامەوە: "هیچ نایزانم بەلاّم تێی دەگەم. ڕۆحگەلی نەوی وا ڕاهاتوون بە دۆخی مادیی کەسێکدا حوکمی بەسەردا بدەن. من بەڕێگە پێچەوانەکەدا دەڕۆم و لەمیانەی کەسەکەوە حوکم بەسەر وەزعی مادیی ویدا دەدەم. ئەمەیان زیاتر لۆگیکیانەترە. من ڕێکێش دەناسم".

بیرک گوتی: "مارکێل، لەوە زیاتر ویسکی مەخۆرەوە".

مارکێل پێکێک ویسکی تری بۆ خۆی و پێکێکی تریشی بۆ بێرک تێ کرد، کە دانیشتبوو لە فەزای خالّیی ڕاماو و وای دەنواند هیچ نابینێت. بادە بە ساردییەکەی من تا ڕادەیەک دەست لێنەدراو بوو، مارکێل بە نیگایەکی پڕ لە نیگەرانی و پێخۆشنەبوون لێی نۆڕی.

لە ناکاوێکرا بێرک لای بۆ کردمەوە، پرسی :

– شتێکم پێ بڵێ، تۆ بە دوای بەختەوەرییەوەیت؟

وەلاّمیم دایەوە: "پێم وایە. چ پێناسەیەکی تر بۆ بەختەوەری نازانم جگە لەوەی کورتە و دەرەنجامی شتێکە کە هەر کەسێک لە هەلومەرجی خۆیدا زێدەخواستراوە بۆی. کەواتە دەبێ بە دڵنیاییەوە مرۆڤ لە دووی بەختەوەری بێت".

بێرک: ئا وایە. بەو شێوەیە ئەوە شتێکی بێ چەندوچوونە. وەڵامەکەی تۆ بۆ سەدەیەمین جار ئەوەم بیردەخاتەوە کە هەموو فەلسەفە تەنیا و تەنیا لەسەر بێمانایی زمانەوانی دەژی و خۆراکی خۆی وەردەگرێ. لەسەر ئەو شلکێنە ناشارستانییەی بەختەوەریدا کەسێک کێکی ڕزگاریی خۆی دادەنێ و ئەویتریش "شاکاری خۆی"، هەردووکیشیان هەموو ئاشنایەتییەک بەهەر جۆرە هەوڵێک بە دوای بەختەوەریدا ڕەت دەکەنەوە. ئەمەش دیارییەکی جێی ئیرەیی پێبردنە کە بەو شێوەیە بتوانرێت بە وشە خۆفریو بدرێت. هەڵبەت مرۆڤ هەمیشە ئارەزووی لەوە بووە خۆی و تێکۆشانی خۆی لە ڕووناکییەک لە ئیدیالیتێتدا ببینێت. ڕەنگبێ بەختەوەرییە قووڵەکە دواجار لەو وەهمەدا بێت کە مرۆڤ بە دوای بەختەوەریدا نەگەڕێت.

مارکێل: مرۆڤ لە دووی بەختەوەری نییە، بەڵکە بەدوای لەزەتەوەیە. سیرێنایکەکان دەیانگوت: دەشێ کەسانێک هەبن بەدوای لەزەتەوە نەبن، بەڵام هۆکاری ئەوە ئەوەیە کە تێگەیشتنیان سەقەتە و توانای قەزاوەتیان تێک چووە.

درێژەی بە قسەکانی دا: "فەیلەسوفان دەڵێن مرۆڤ لە دووی بەختەوەری یان لە دووی "ڕزگاری" یاخۆ لە دووی "شاکاری خۆیەتی"، ئەوانە تەنها بیر لە خۆیان دەکەنەوە یاخۆ لانی کەم بیر لە خەڵکانێکی گەورە بە تەرزێک لە پلەوپایەی خوێندەوارییەوە دەکەنەوە. پار هالستروم(*) لە یەکێک لە نۆڤێلەکانیدا دەڵێ کە چۆن هەموو ئێوارەیەک بە منداڵیی دەیخوێندەوە: "چرا دێت و چرا دەڕوا، چرا دەزانێ خوا کێی خۆش دەوێ(**)". بە ئاشکرا دیارە کە لەو تەمەنە ساواییەدا مانای وشەی "بەختەوەری" نەزانیوە، لەبەرئەوە

(*) Per Hallstrom: ١٨٦٦ – ١٩٦٠ نووسەر و فەیلەسوفی سوێدی، زیاتر نوڤلێتی نووسیون و دراماکانی شەکسپیریشی کردوونەتە سوێدی. و. کوردی.

(**) وشەی Lykta بە مانای چرا و Lyckaش بە مانای بەختەوەرییە، هەردوو وشەکە خاوەن هەمان جیناسی گۆکردنن. دوعاکە بەم جۆرەیە: بەختەوەری دێت و بەختەوەی دەڕوا، بەختەوەری دەزانێ کە خودا کێی خۆش دەوێ. و. کوردی.

نائاگا ئەو وشە نائاشنا و لە تێگەیشتن نەهاتووەی بە وشەیەکی ئاشنا و هاسان بۆ تێگەیشتن قەرەبوو کردووە. بەڵام خانەکانی لەشمان بەهەمان شێوەی منداڵێک شتێکی کەم لەبارەی "بەختەوەری" یان "ڕزگاری" یاخۆ "شاکار"ەوە دەزانن. هەر ئەوانیشن بڕیار لەسەر تەقەلای ئێمە دەدەن. هەموو شتێک کە لەسەر ئەم ئەرزە پێی دەگوترێت ئەندامی زیندوو، لە عەزاب هەڵدێ و بەدوای لەزەتدا دەگەڕێ. فەیلەسوفان تەنیا بیر لە تەقەلا ئاگایانەکانی خۆیان، لە تەقەلا دوودڵانەکانی خۆیان دەکەنەوە، کە دەتوانرێت بگوترێ: تەقەلا خۆخەڵەتێنەرەکانی خۆیان. بەڵام بەشە نائاگایانەکانی بوونی ئێمە هەزاران جار گەورەتر و بە هەژموونترە لە بەشە ئاگایانەکان، دەی هەر ئەم بەشەشە کە بڕیار دەدات.

بیرک : هەموو ئەوەی تۆ گوتت ئەوە دەسەلمێنێ کە من تازەکی گوتم لەبارەی ئەوەی گەر مرۆڤ بتوانێت لەمیانەی قسەکردن لەبارەی فەلسەفەوە ئەنجامێکی دەست کەوێت، ئەوا دەبێ زووبان لە بناغەوە دارێژرێتەوە.

مارکێل: بەڵێ خوای گەورە! تۆ بەختەوەریی خۆت بۆ خۆت هەڵگرە و منیش لەزەت هەڵدەگرم. لە خۆشیتان! بەڵام من گەر لەگەڵ ئەو بەکارهێنانە زمانەوانییەی تۆدا بم، لەبەرئەوە نییە کە ڕاستە هەموان لەدووی بەختەوەرین. خەڵکانێک هەن هیچ ئامادەییەکی بەختەوەرییان نییە و وەک چەمکێکی نارەحەت و لە گۆڕاننەهاتوو تەماشای دەکەن. ئەو خەڵکانە لە دووی بەختەوەری نین، بگرە بە دوای ئەوەوەن کە نەختێک شێوە و ستایل بدەنە بەدبەختییەکانیان.

لە ناکاوێکڕا و بە تەرزێکی چاوەڕواننەکراو درێژەی بە قسەکانیدا:

– گلاس یەکێک لەو کەسانەیە.

ئەم قسەیەی دوایی هێند سەری سوڕماندم کە هیچ وەڵامێکم شک نەبرد بیدەمەوە. هەتا گوێم لێ نەبوو ناوی هێنام، وام زانی باسی خۆی دەکات. هێشتاش پێم وایە بۆیە وای گوت تا ئەو شتە بشارێتەوە کە لە منی پێدا.

بێدەنگییەکی گوشارهێن باڵی کێشا. من لە درەخشانەوەی ڕووبارەکەم دەنۆڕی. لە گەواڵە هەورەکانی سەر ڕۆسینبادەوە دەلاقەیەکی تریفەی مانگ کرایەوە و سیلڤەرێکی ڕەنگپەڕیو ڕژایە سەر نمای کۆڵەگەی خانووە بۆندییە دێرینەکە. لە دەرەوە بەسەر مێلارێنەوە هەورێکی سووری وەنەوشەییباو بە تەنیا لە هەورەکانی تر جیا بووبووەوە و بۆ خۆی هێواش هێواش دەجووڵا.

## ٢٥ی یولی

هێلگا گریگۆریۆس: هەمیشە لەبەرچاومدایە. بەو شێوەیەی لە خەونەکەدا بینیم، دەیبینم: ڕووت، چەپکێک گوڵی تاریکی بۆ ڕایەڵ کردووم، ڕەنگ بێ سوور، بەڵام زۆر تاریک. بەڵێ، هەڵبەت سوور هەمیشە لە زەردەپەڕدا دەبێتە زۆر تاریک.

هیچ شەوێک ناچمە ناو جێگە بەبێ ئەوەی ئاوات نەخوازم کە هەمدیس بێتەوە خەونم. بەڵام خەیاڵم توانی وردە وردە زەردەخەنە دوو فاقەکەی بسڕێتەوە، چی دی ئەو زەردەخەنەیە نابینم.

***

حەزدەکەم قەشە بگەڕایەتەوە، ئەوسا بە دڵنیاییەوە خاتوو گریگۆریۆس هەمدیس بۆ ئێرە دەهاتەوە. حەز دەکەم بیبینم و گوێم لە دەنگی بێت. حەز دەکەم لە لام بێت.

## ٢٦ی یولی

قەشە: ڕوخساری ئەویش بە دوامەوەیە - ڕێک بەو دەربڕینەی سەر ڕوخسارییەوە بە دوامەوەیە کە لە دواین یەکتربینینماندا هەیبوو، ئەو جارەی کە وتووێژەکەمانم بردەوە سەر مەسەلە سێکسواڵییەکان. چۆن دەتوانم ئەو دەربڕینەی ڕاڤە بکەم؟ ئەو دەربڕینە هی کەسێکە کە بۆنێکی گەنیوی کردبێ و بە نهێنیش ئەو بۆنەی لە کەپوودا پێ بۆنێکی خۆش بێت.

## ٢ی ئۆگۆستی

مانگ تریفە دەدا. هەموو پەنجەرەکانم کراونەتەوە. لە ژووری کارکردنمدا چرا دەسووتێ، چراکەم لەسەر مێزی نووسینەکە دانا تا لە جێگەیەکی بانەگردا بێت، کاتێ بای شەو بە ئارامی هەڵدەکا و پەردەکە وەک چارۆکەیەک پڕ لە هەوا دەکا. بە ژوورەکەدا دێم و دەچم، جاروبار لای مێزەکەوە ڕادەوەستم و بە پەلە ڕستەیەک دەنووسم. ماوەیەکی درێژ لەبەر یەکێک لە پەنجەرەکانی هۆڵەکەدا ڕاوەستام و تەماشای دەرەوەم کرد و گوێم بۆ هەموو دەنگە سەیرەکانی شەو ڕادێرا. بەڵام ئەمشەو خوارەوە، ژێر درەختە تاریکەکان بێدەنگە. تەنها ژنێکی تەنیا لەسەر سەکۆیەک دانیشتووە، ماوەیەکی زۆرە لەوێدا دانیشتووە. مانگیش تریفە دەدا.

**

کاتێ پاشنیوەڕۆ بۆ ماڵەوە گەڕامەوە، کتێبێک لەسەر مێزەکەم بوو. کە کردمەوە کارتێکی سەردانی بە ناوی ئێڤا مێرتێنس، لێ کەوتە خوارەوە.

لە یادمە لەو ڕۆژانەدا باسی ئەو کتێبەی بۆ کردم و منیش هەروا گوتم شتێکی خۆشە بخوێنرێتەوە. ئەوەم لە ڕووی ئەدەبەوە گوت تا بێ نەزاکەتی نەنوێنم بۆ شتێک کە لای ئەو سەرنجڕاکێشە. پاشان چی دی لەوە زیاتر بیرم لەوە نەکردەوە.

بەڵام کەواتە ئەو بیری لێ کردووەتەوە.

ئایا من ئێستا زۆر دەبەنگم گەر پێم وابێ کە ئەو نەختێک حەزی تێم چووە. هەڵبەت کە سەیری دەکەم هەست دەکەم عاشقە. بەڵام ئەگەر ئەو عاشقی کەسێکی تر بێت، ئەی چۆن هێند زۆر هۆگری منە؟

ئەو خاوەن دوو چاوی شینی ڕوون و ڕاستگۆیانە و پرچێکی پڕی قاوەیی. کەپووی نەختێک بە هەڵە فۆرماو. دەمی – دەمیم نایەتەوە بیر. ئا، سوور و کەمێک گەورەیە، بەڵام تەواوێک بیرم ناکەوێتەوە، مرۆڤ تەنیا بەباشی دەمێکی بیر دەکەوێتەوە کە ماچی کردبێت، یان زۆر پەرۆشی ماچکردنی بووبێت. من شارەزای دەمێکم کە بیناسم.

دادەنیشم و لەو کارتی سەردانە بچووکە ساکارە ڕێکوپێکە دەنۆڕم، کە ناوەکەی بە نووسینێکی کاڵی لیتۆگرافیکراو، لەسەری نووسراوە. بەڵام من لە ناوەکە زیاتر دەبینم. جۆرە نووسینێک هەیە کە تەنیا لەژێر کاریگەریی گەرمایییەکی بەتیندا دەبینرێت. گەرماییەک کە نازانم ئاخۆ من هەمە، بەڵام من لەگەڵ ئەوەشدا نووسینە نەبینراوەکە دەخوێنمەوە: "ماچم بکە، ببەرە مێردم، منداڵم لێ بخەرەوە، لێ گەڕێ عاشق بم. من پەرۆشی ئەوەم عاشق بم".

"زۆر کیژی جحێڵی پاقیژە لێرەوە دەڕۆن، کە هێشتا هیچ پیاوێک دەستی بەریان نەکەوتووە و لە بەتەنیایی نووستندا ناگەشێنەوە. ئەوانە دەبێ خاوەن مێردی باش بن".

تا ڕادەیەک وای گوت زەردەشت. زەردەشتە ڕاستەقینەکە، زەردەشتە دێرینەکە، نەک ئەوەی کە قامچییەکەی بە دەستەوەیە.

ئایا من "پیاوێکی باش"م؟ ئاخۆ دەتوانم بۆی ببمە پیاوێکی باش؟

نازانم ئەو چ وێنەیەکی لەبارەی منەوە لای خۆی کێشاوە. ئەو نامناسێت . لە زەینی سووکەڵەی ئەودا، کە تەنێ جێگای چەند خایلەیەکی بەسۆز و میهرەبانی تێدا دەبێتەوە لەبارەی ئەو کەسانەوە کە نزیکین، جگە لەوە ڕەنگیشە نەختێک بێ کەڵکە وێنەیەکی لەلای کێشابێت، کە هەندێک شێوەی ڕوخساری منی تێدابێ، بەڵام ئەوە خۆم نیم، ئیدی حەزی چووەتە سەر ئەو وێنەیە، خوا دەزانێ بۆچی، ڕەنگە هۆی سەرەکی لەبەرئەوە بێت کە من ژنم نەهێناوە و بوخچەی نەکراوەم. بەڵام گەر ئەو منی ناسیبا، گەر بۆ نموونە ئەو

بە ڕێکەوت ئەو شتانەی لەم پەڕە کاخەزانەدا خوێندبایەتەوە کە من شەوانە دەیاننووسم، بەڵێ، پێم وایە بە شەرمێک و بەڵام بە غەریزەیەکی ڕاستەقینەوە لەو ڕێگایانە پاشەکشێی دەکرد کە من پیایاندا دەڕۆم. پێم وایە گەرووی نێوان ڕۆحەکانمان کەمێک زیاد لە ئەندازە گەورەیە. یان کێ چوزانێ: گەر مرۆڤ شان بداتە بەر هاوسەرگری، کێ نالێ بە پێچەوانەوە مایەی بەختەوەرییە کە جیاوازییەکە ئاوها گەورە بێت – ئەگەر کەمتر بوایە، وەسوەسە دەبووم کە هەوڵ بدەم پڕی بکەمەوە، ئەوەش شتێک بوو هەرگیز ئەنجامی نەدەبوو! ئەو ژنەی دەتوانم خۆمی بۆ بەرهەڵدا بکەم، بوونی نییە! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە شان بەشانی ئەو بژیم و هەرگیز لێ نەگەڕێم بێتە ناو ئەوەوە کە لە ڕاستیدا من چیم و کێم – ئاخۆ بنیادەم بۆی هەیە ئاوها لەگەڵ ژنێکدا بکات؟ لێ گەڕێ یەکێکی تر لەئامێز بگرێ بەو خەیاڵەوە کە ئەو کەسە منم؟ ئاخۆ مرۆڤ بۆی هەیە وا بکات؟

ئا، هەڵبەت بۆی هەیە. لە ڕاستیدا هەمیشە هەر وا بووە، مرۆڤ زۆر کەم لەبارەی یەکترەوە دەزانن. مرۆڤ سێبەرێک لە ئامێز دەگرێ و عاشقی خەونێک دەبێ. ئەدی وەکی دی من چی لەبارەی ئەوەوە دەزانم؟

بەڵام من تەنیام، مانگ تریفە دەدا، منیش تامەزرۆی ژنێکم. دەمتوانی ئارەزووم هەبا و بچوومایەتە بەر پەنجەرەکە و ئەو ژنەم بانگ کردبایەتە سەرەوە کە لە خوارەوە بە تەنیا لەسەر سەکۆکە دانیشتووە و چاوەڕێی کەسێک دەکات کە نایەت. شەرابی شیرین و مەی و بیرە و خواردنی خۆشم هەن و نوێنێکی ڕاخراویش. هەڵبەت ئەمە بەهەشتە بۆ ئەو.

**

دادەنیشم و بیر لە قسەکانی ئەم شەوانەی مارکێل دەکەمەوە سەبارەت بە من و بەختەوەری. هەر بەڕاستی حەز دەکەم بمتوانیبا ژنم هێنابا و وەک بەرازی دابەستە بۆ جێژنی کریستمەس، بەختەوەربام، تەنیا بۆ ئەوەی ئەوم تووڕە کردبا.

## ٣ی ئۆگۆستی

بەڵێ، مانگ. مانگ هەمدیس بە ئاسمانەوەیە.

من مانگی زۆرم لە یادن. دێرینترین مانگ کە لە یادمدا بێت، مانگەکەی ئەودیو چوارچێوەی پەنجەرەی شەوەکانی بەراییی یەکەمین زستانی تافی منداڵیمە. مانگ هەمیشە بە ژێر ساپیتەیەکی سپییەوە بوو. جارێکیان دایکم (پاپا نۆئێل)ەکەی ڤیکتۆر ڕیدبێری[*] بە دەنگی بەرز بۆ ئێمەی منداڵان دەخوێندەوە، من دەسبەجێ مانگم ناسییەوە. بەڵام هێشتا هیچکام لەو سیفەتانەی نەبوو کە دواتر بەخۆوەی گرت، نە میهرەبان بوو نە عاتیفی یان سارد و ترسناک. تەنیا گەورە و پرشنگدار. مانگ پێوەندیی بە پەنجەرە و پەنجەرەش پێوەندیی بە ماڵەوە هەبوو. مانگ لەلای ئێمە دەژیا.

پاشان هەستیان کرد کە من مۆسیقیم و ڕێگەیان دام وانەی پیانۆ وەربگرم و ئیدی هێند پێشڤە چووم کە دەمتوانی نەختێک پەنجە لە چۆپین[**] بژەنم، ئەوسا مانگ لەلام ڕوخسارێکی نوێی بەخۆوە گرت. لەیادمە شەوێکیان کە تەمەنم نزیکەی دوازدە ساڵان بوو، بێدار بووم و خەوم لێ نەدەکەوت، لەبەرئەوەی نۆکتێرنێن[***]ی دوازدەی چۆپێن لە کەللەمدا و لەبەرئەوەش کە مانگ تریفەی دەدا. ئەوە لە گوند بوو، ئێمە تازەکی گواستبوومانەوە و هێشتا پەردە بەو ژوورەوە نەبوو کە منی لێ دەنووستم. تریفەی مانگ بە تاڤگەیەکی گەورە و سپی دەڕژایە ژوورەکە و سەر تەختەنوێنەکە و سەر باڵشتەکەم. لەسەر تەختەنوێنەکە ڕاست بوومەوە و گۆرانیم گوت. من دەبوو گۆرانییە

---

(*) Viktor Rydberg: ١٨٢٨ – ١٨٩٥ نووسەر و شاعیر و فەیلەسوفی تیۆلۆگ.

(**) Frederic Chopin: ١٨١٠ – ١٨٤٩ پیانیستی پۆڵەندایی، لە ساڵی ١٨٣١ەوە لە پاریس گیرسایەوە و لەوێ جۆرج ساندی و عاشقی بوو. مۆسیقای چۆپین بە ستایلە شاعیری و ڕیتمیک و هارمۆنییەکەی دەناسرێتەوە. و. کوردی.

(***) nocturne: پارچەیەک مۆسیقایە کە زیاتر بە پیانۆ دەژەنرێ و دەبێتە مایەی خولْقانی شەوانەکەشێکی خەونئامێز. و. کوردی

نایابەکە کە نەمدەتوانی لەبیری بکەم، بەبێ وشە چڕیبام. ستران و تریفەی مانگ بوونە یەک و بەڵێنێک لەبارەی شتێکی بێ هاوتاوە لە هەردووکیاندا هەبوو، شتێک کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بەختم دەیهێنا، شتێک کە نەمدەزانی چییە، بەختەوەرییەکی خراپ، یاخۆ بەدبەختییەک کە بەهای لە هەموو بەختەوەرییەکانی سەر ئەرز زیاتر بوو، شتێکی سووتێنەر و بەچێژ و گەورە کە چاوەڕێی دەکردم. سترانم چڕی تا باوکم لەناو دەرگاکەدا ڕاوەستا و نەڕاندی بە سەرمدا کە بنووم. ئەوە مانگی چۆپین بوو. ئەوە هەمان ئەو هەیڤە بوو، کە پاشان کاتێ ئالیس سترانی دەچڕی، لە شەوانی مانگی ئۆگۆستیدا بەسەر ئاوەکەوە دەلەرزی و دەسووتا. من ئالیسم خۆش دەویست.

ئینجا مانگەکەی ئۆپسالام بیر دێتەوە. هەرگیز هەیڤێکی ترم نەبینیوە لەو هەیڤە ساردتر و پەرێشانتر بێت. ئۆپسالا کەشوهەوایەکی تەواو جیاوازتری لە ستۆکهۆڵم هەیە، کەشێکی ناوەکی بە هەوای وشکتر و ڕوونترەوە. شەوێکی زستان لەگەڵ هاوڕێیەکی لە خۆم گەورەتردا بە جادە بە بەفر پۆشراوەکاندا، بە خانووە خۆڵەمێشی و سێبەرە ڕەشەکانیانەوە، دەهاتین و دەچووین. لەبارەی فەلسەفەوە دەدواین. بەو حەقدە ساڵییەی خۆمەوە باوەڕێکی ئەوتۆم بە خوا نەبوو، بەڵام خۆم لە بەرەی دژە داروینیسمدا دانابوو، پێم وابوو هەموو شتێک لەودا بێ مانا و گێلانە و بوودەڵە دەبێت. بە ژێر گومبەزێکی ڕەشی تەنکدا ڕۆیشتین و بەسەر چەند پێپلیکانەیەکدا سەرکەوتین و سفت بەپاڵ شووراکانی کڵێسای گەورەوە ڕاوەستاین. پایەبەندی بیناکە لە ئێسکە پەیکەری ئاژەڵێکی دەگمەن لە پێکهاتووە مردووەکان دەچوو. هاوڕێکەم باسی خزمایەتیی ئێمەی لەگەڵ برا ئاژەڵەکاندا دەکرد، ئەو دەدوا و بەڵگەی دەهێنایەوە و بە دەنگێکی تیژ و ناشارستانییانە و شێوەزارێکی لادێیییانە دەیقیژاند کە لە نێوان شووراکاندا دەنگی دەدایەوە. من زۆر وەڵامیم نەدەدایەوە، بەڵام لەگەڵ خۆمدا بیرم دەکردەوە: تۆ هەڵەیت، بەڵام من هێشتا کەمم خوێندووەتەوە و بیرکردووەتەوە تا بە درۆت بخەمەوە. بەڵام ڕاوەستە، تەنیا ساڵێک لێم ڕاوەستە، ئەوسا لەتەکتدا دێم بۆ هەمان ئەم جێگەیە و لە شەوێکی

مــانگەشــەوی وەک ئەمــشــەودا پیـشــانت دەدەم کــە تۆ چەند هەڵەیت و تۆ چ دەبەنگێک بوویت. چونکە ئەوەی کە تۆ ئێستا دەیڵێیت ناکرێ و نابێ لە هەر هەلومــەرجــێکدا ڕاست بێت، گــەر ڕاست بێت، ئەوا من نامــەوێت چیــدی لە دنیــایەکی وادا بژیم کــە هیچ شــتــێکم نەبێ بیکەم. بەڵام هاوڕێکەم کــە نامیلکەیەکی گچکەی ئەڵمانی بە دەستــەوە و ئەرگیومــێنتــەکانی خــۆی لێوە هەڵگۆزی بوون، قسانی دەکرد و قڵافەی دەنواند. لە ناکاوێکرا لەناوەڕاستی تریفــەی مــانگدا ڕاوەســتــا، کــتــێــبــەکــەی لە جــێگایەکــدا کــردەوە، چەند ڕوونکردنەوەیەکی میتافۆری تێکستەکە بوو، بۆی ڕاگرتم. تریفەی مانگ هێند ڕۆشن بوو کــە مــرۆڤ دەیتــوانی هەم وێنەکــە ببــینــێ و هەم تێکســتــەکــەش بخــوێنێــتــەوە. وێنەی سێ کــەللەســەر بوو کــە تا ڕادەیەک لەیەک دەچوون-: کەللەسەری ئورانگوتانگ[*]ێک ، قووڵەڕەشێکی ئۆستورالی و ئیمانۆیل کانت. بە بێزارییەوە کتێبەکەم بۆ دوور فڕێ دا، هاوڕێکەم تووڕە بوو و پەلاماری دام، لەبەر تریفەی مانگدا پێکدا هەڵپژاین و کەوتینە زۆران، بەڵام ئەو بەهێزتر بوو، خستمییە ژێر خۆی و بە شێوەی قوتابی قوتابخانەکان بە بەفر "شۆردم"ی.

ساڵێک و ساڵانێک تێ پەڕین، بەڵام هەرگیز هەستم نەدەکرد گەورە بووم تا هەڵەکانی بۆ بسەلمێنم، هەستم دەکرد وا باشترە بەردێک لەسەر ئەو مەسەلەیە دانێم. گەرچیش تێ نەگەیشتووم کە دەبێ لەم دنیایەدا چی بکەم، کەچی هەر تیایدا ماومەتەوە.

لەوساوە زۆر هەیڤم بینیون. هەیڤێکی ناسک و عاتیفی لە نێوان سپیداردا لە رۆخی زەریاچەیەک... هەیڤێک کە بەخێرایی بەنێو تەمدا و بەسەر زەریادا دەبزوێت... هەیڤێک کە بەنێو هەورە پایزەی پێکدا چرژاودا دەرەڤێت... هەیڤی ئەڤین کە لەبەر پەنجەرەی باخچەکەی گرێتچین[**] و بانیژەکەی یولیادا پرشنگ

---

(*) orangutang: ئینسانە مەیمونێک بەباسکی زۆر درێژ و پێستەی درێژ و سووری ڕەساسی باوەوە. و. کوردی.

(**) Gretchen: (مارگەرێتا) یەکێک لە کەسێتییە سەرەکییەکانی فاوستی گۆتێ، کیژێکی گەنجە کە فاوست فریوی دەدا. و. کوردی.

دەدا... جارێکیان کیژێک کە ئیدی گەنج نەبوو، زۆر حەزی دەکرد شوو بکات، پێی گوتم کاتێ هەیڤی بینیوە بەسەر کوختێکی بچکۆلانەی دارستاندا پرشنگی داوە، بە ناچاری کوڵی گریانی بەربووە... شاعیرێک دەڵێ مانگ شەهوانی و هەوەسبازە. شاعیرێکی تر هەوڵ دەدا مەیلێکی ئەخلاقی-ئاینی بە تریفەی مانگ بدا و بە دەزووگەلێک دەیانچوێنێ کە مردووانی ئازیز ڕێساویانە و کردوویانەتە تۆڕێک تا ڕۆحێکی ڕێ لێبزربووی پێ بگرن... هەیڤ بۆ گەنج بەڵێنێکە لەبارەی هەموو ئەو شتە دەگمەنانەوە کە چاوەڕێیان دەکا، بۆ کەسێکی پیر ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە بەڵێنەکە نەبراوتە سەر، وە یادهێنانەوەیەکە لەبارەی هەموو ئەو شتانەوە کە شکاون و وردوخاش بوون...

ئەدی تریفەی مانگ چییە؟

تیشکی خۆرە بە دەستی دوو. لاواز و ساختەیە.

**

ئەو هەیڤەی کە ئێستا لەودیو بورجی کڵێساوە خۆی دەخزێنێتە پێشێ، ڕوخسارێکی بەدبەختانەی هەیە. وا دێتە پێش چاوم کە هێڵەکانی ڕوخساری بە عەزابێکی بێ ناونیشان، درێو و داخوراو و داوەشاوە. هەی داماو، بۆچی تۆ لەوێدا دانیشتوویت؟ ئایا وەک ساختەکارێک حوکم دراویت - چما تۆ تیشکی خۆرت تەزویر کردووە؟

لە ڕاستیدا ئەوە تاوانێکی گچکە نییە. ئەوەی بیکات دڵنیا دەبێ کە هەرگیز شتێکی ئاوها نەکات.

## ٧ی ئۆگۆستی

ڕووناکی!

.... لەسەر تەختەنوێنەکەم ڕاست بوومەوە و لەمپای سەر مێزۆکەی تەختی نووستنەکەم داگیرساند. شەلاڵ بووبووم لە ئارەقەیەکی سارد و قژم بە نێوچەوانمەوە لچکابوو... ئەدی چ خەونێکم بینی بوو؟

هەمدیس هەمان خەون. خەونی ئەوەی کە قەشەم کوشتووە. کە ئەو دەبێ بمرێ، لەکاتێکدا کە بەر لە مردنی بۆنی تەرمی لێ دەهات، ئەوە ئەرکی منە وەک پزیشکێک بەو کارە هەستم... من ئەو کارەم وەک شتێکی زەحمەت و دڵنەخواز دەبینی، شتێک بوو کە هەرگیز لە پیشەکەمدا بۆم نەهاتبووە پێش. زۆر حەزم دەکرد ڕاوێژ بە یەکێک لە هاوکارەکانم بکەم، نەمدەویست لە شتێکی ئاوها خەتەردا بە تەنێ هەموو بەرپرسیارییەتییەکە هەڵبگرم... بەڵام خاتوون گریگۆریۆس لە دوورەوە بە ڕووتی لە قوژبنێکدا و لە نیوە تاریکیدا ڕاوەستاو و هەوڵی دەدا بە ڕووپۆشێکی گچکەی ڕەش خۆی حەشار بدات. کاتێ کە گوێی لێ بوو وشەی (هاوکارێک) گۆ دەکەم، دەربڕینێکی هێند زەندەقبەرانە و نائومێدانە لە چاوانیدا وەدیارکەوت، کە ئیدی حاڵی بووم دەبێ دەسبەجێ کارەکە ئەنجام بدەم، ئەگینا ئەو بە شێوەیەک لە شێوەکان کە نەمدەتوانی بزانم چۆنە، تیا دەچوو. دەبوو خۆم بەتەنێ ئەو کارە بکەم و لێ نەگەڕابام کەسی تر پێی زانیبا. کاتێ سەرم وەرگێڕابوو، کارەکەم کرد. ئەدی ئەوە چۆن بوو؟ نازانم. تەنیا دەزانم کەپووم گرتبوو، لام کردبووەوە و بەخۆم دەگوت: ئەها تەواو، هەر ئێستا تەواو. ئیدی لەوە زیاتر بۆگەنی نایەت. حەزم دەکرد بۆ خاتوون گریگۆریۆسی ڕاڤە بکەم، ئەوەی ئەم مەسەلەیە شتێکی دەگمەن و سەیربێ: "لەبەرئەوەیە کە زۆربەی خەڵک دوای مردن بۆن دەکەن و ئیدی مرۆڤ دەیاننێژێ، بەڵام ئەگەر کەسێک بە زیندوویی بۆن بکا، ئەوا دەبێ مرۆڤ بیکوژێت، لە ڕەوتی زانستی ئەمڕۆدا جگە لەوە چ ڕێگە چارەیەکی تر نییە.." بەڵام خاتوو گریگۆریۆس دیارنەمابوو، تەنیا ژوورێکی گەورەی چۆڵ لە دەورمدا بوو کە پێ دەچوو هەموو شتێکی لێم هەڵبێت و دەرباز بێت... تاریکییە مەیلەو ڕۆشنەکە بە تریفەی مانگی ڕەنگ خۆڵەمێشی گۆڕدرا... من قنج و قیت و تەواوێک بێدار لەسەر تەختەنوێنەکەم دانیشتم و گوێم بۆ دەنگی خۆم ڕادێرا.

هەستام.

پارچەیەک جلم لەبەرکرد، گڵۆپی هەموو ژوورەکانم داگیرساند. نازانم

چەندێک ئاسـایی وەک کـاتژمـێـر، هاتم و چووم. دواجـار لەبەردەم ئاوێنەی مـێـزەکـەدا لە هـۆڵەکـە ڕاوەسـتـام و وەک غـەریبـەیەک زەق زەق لـە خـۆمی ڕەنگپـەڕیو و شـێـواوم ڕووانی. بـەڵام لە ترسی ئـەوەی کـە نەبا لـە خـۆوە بە سـەرمدا بێ و ئەو ئاوێنە دێرینە وردوخـاش بکەم کـە تافی منداڵی و نزیکەی هەمـوو ژیانم و زۆربەی شـتـەکـانی بەر لـە لەدایکبـوونیـشـمی بینیـوە، دوورکەوتمەوە و لەبەر پەنجەرەیەکی کراوەدا ڕاوەستام. چی دی ئێستا مانگ تریفەی نەدەدا، نمەی باران بەر ڕوخسارم دەکەوت. زۆر جوان بوو.

"خــەونەکـــان وەک ڕووبـار دەڕۆن"... ئەی پەندی دانـایانەی دێرین لـە یادمدایت. زوربەی ئەوەی مرۆڤ کە لـە خـەوندا دەیبینێ، لە واقیعـدا بەهای خـایلەیەکی نییـە – وردە تەڵـەزمی ئەوەیە کـە بنیـادەم ئەزمـوونی کـردووە، بە زۆری لە بێ بەهـاترین و ناچیـزەترینی ئـەو شـتـانەی کـە ئاگـاییی پارێزگـاری لێکردنیـانی بە پێـویست نەزانیـوە، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لە هۆدەیەک لە هۆدەکـانی شـتـە بێکەڵکەکـانی زەینیدا درێژەیان بە ژیانی تارمـایی ئـاسـای خۆیان داوە. بەڵام هـەروەها خـەونی تر هـەن. لەیادمـە جارێکیـان کـە کوڕێکی منداڵ بووم بە درێژاییی پاش نیوەڕۆیەک دانیشتم و لە حەلکردنی کێشەیەکی ئەندازەیی ڕامـام، چوومـە نێو نوێنەکەم و نووستم بەبێ ئەوەی حـەلم کـردبێت: لە خـەوندا مێشکم لە کاری خـۆی بەردەوام و حـەلەکەی پـێ دام و وەڵامەکەش ڕاست بوو. هـەروەها خـەونگەلێکیش هەن کە لە قووڵاییەوەڕا بڵق دەدەن. کە باش بیر دەکەمـەوە دەبینم: زۆر جاران خەونگەلێک شتێکیان لەبارەی خۆمەوە فـێـرکـردووم. زۆر جـاران خـەون ئەو ئارەزووانـەی بۆ ئاشکرا کـردووم کـە نەمویستووە بیانخوازم، پەردەی لەسـەر ئەو حەزانە بۆ هەڵماڵیوم کە بە ڕۆژی ڕووناک نـەمـویستــووە بزانم چین. من پاشـان ئەو حـەز و ئارەزووانەم لەبەر ڕووناکیی تەواودا کـێـشـانە و تاقیکردوونەتەوە، بەڵام بە زەحـمـەت بەرگـەی ڕووناکـیـیـان گـرتووە. بە زۆری بەرەو هـەمـان قـووڵایی تاریک کـە نەسـەبیان دەچووەوە سـەری، ڕۆبردووەتـەوە. لە خـەونەکانی شـەودا هەمدیس توانیـویانە سـەرلەنوێ بگەڕێنەوە، بەڵام من ناسـیـومنـەتەوە و تەنانەت لە خـەونیـشـدا

زەردەخـەنەی گاڵتـەجـاڕانەم بۆ کردوون، تـا ئەوەی کە ملـیـان داوە بۆ هـەمـوو مەرجەکان بەوەی کە بێنە سەرەوە و لە واقیع و ڕووناکیدا بژین.

بەڵام ئەمـە شـتـێکی ترە. دەمـەوێت بزانم چیـیـە، گـەرەکـمـە کـێـشـانە و ئەزمـوونی بکەم. ئەوە یەکێکە لە هێزە بنەڕەتییـەکانی بوونم کە بڕسـتی نیوە ئاگـایی و نیـوە ڕۆشنیی لای خـۆم نییـە، ئەگـەر لە توانامـدا بێت ئەوا بۆ نێـو ڕووناکی هەڵی دەگۆزم و سەیر دەکەم بزانم چییە.

کەواتە لێ گەڕێ با بیری لێ بکەینەوە:

ژنێک لە بێدەرەتانیی خۆیدا هاتووە بۆ لام و منیش گفتم داوەتێ یارمـەتیی بدەم. ی ا ر م ە ت ی، بەڵێ - بەڵام ئایا ئەوە مـانـای چییە یاخۆ دەکرێ مـانـای چی بێت، لە کاتێکدا کە هیچ کام لە ئێمە لەو کاتەدا بیرمان لێ نەکردووەتەوە. هـەڵبـەت ئەوەی کـە داوای لـێ کـردووم چـتـێکی زۆر سـاکـار و هـاسـانـە. نەوەک تەقـەلا لەسـەرم کـەوت و نەوەک ترس و دڵەلـەرزەی نادڵنیـایی، بگـرە ڕاسـتـتـر چێژم لێ برد، خزمـەتێکی ناسکم بەو ژنە جـاحـێڵـە کرد و دەگـەیەکی بەدیشم لەو قەشە بڵـحـە دا، لە دڵتەنگییە ئەستوورە تاریکەکەمدا، ئەم ڕووداوە گچکەیە هـاتە دەرەوە و وەک شـەرارەیەک بە ڕەنگی گـوڵ لـە جـیـهـانێکەوە کـە بۆ من داخراو بوو، پرشنگی دا... هـەڵبەت ئەمە بۆ ئەو مانـای بەختەوەری دەگەیاند لە ژیاندا، ئەو شـەرارەکەی بینی و لێ گـەڕا منیش بیبـینم. ئەوسـا گـفـتـم پـێ دا یارمەتیی بدەم و ئەو شتەم کرد کە دەبوو لەو کاتەدا بیکەم.

بەڵام پـاشـان هـەمـوو ئـەوە وردە وردە ڕوخـسـارێکی تری بـەخـۆوە گـرت. ئـەمـجـارەیـان بەر لـەوەی ئـەولاوەتر بڕۆم، دەبـوو بچـمـە بـنـج و بـنـەوانـی مەسـەلەکەوە.

بەڵێنـم دا یارمـەتیـی بدەم، بەڵام حـەز ناکـەم شـتـێک تا نیـوە بکەم. هـەڵبـەت ئێـسـتـا دەزانم و مـاوەیەکی زۆریشـە دەیزانم کـە یارمـەتیـدانی ئـەو نابێ لەوە کەمتر بێت، کە نەبێتە هۆی ئازادکردنی.

یەک دوو ڕۆژێکی تـر قـەشـە دێتـەوە - ئـەوسـا چیـرۆکە کـۆنەکە سـەرلەنوێ

دەست پێ دەکاتەوە. من هەڵبەت ئێستا ئەو کابرایە دەناسم. مەسەلەکە هەر ئەمە نییە، بگرە دواجار خاتوو گریگۆریۆس هەوڵ دەدا بە تاقی تەنیا لە قەرەی کێشەکە بێت، چەندێکیش کە ئەوە قورس و زەحمەت بێ و ژیانی لەتوپەت بکا و بیکاتە پەرۆکۆن. بەڵام شتێک هەیە هێند دڵنیام دەکا وەک بڵێی پێشتر رووی دابێ، ئەویش ئەوەیە کە ئەو بەو زووانە دووگیان دەبێ. بەو شێوەیەی کە ئێستاکانێ عەشق دەکا، ناکرێ خۆی لەم شتە لادا. ڕەنگە ئەو ئەمەی نەوێت، بەڵام ئەگەر ئەمە ڕوو بدات – کاتێ ئەمە ڕوو دەدات– ئەوسا چی...؟ ئەوسا دەبێ قەشە دوور بخرێتەوە. تەواوێک دوور بخرێتەوە.

بە ڕاستمە: گەر ئەوە ڕوو بدات، ئەوسا بۆی هەیە بێتە لام و ڕووی هەمان ئەو یارمەتییەم لێ بنێت کە پێشتر ژنانێکی زۆر، بێهودە لێیان ناوم – گەر داوای ئەو یارمەتییە بکات ئەوا دەبێ بە دڵی بکەم، لەبەرئەوەی نازانم لە هیچ شتێکدا داوای ڕەت بکەمەوە. بەڵام تا ئەو شوێنەی پێوەندیی بە منەوە هەبێت، دەبێ ئەم مەسەلەیە کۆتاییی بێت، ئاخر منیش بە هەموو ئەم بەزمەوە ماندوو بووم.

بەڵام هەست دەکەم، هەست دەکەم و دەزانم کە مەسەلەکە بەم شێوەیە ناچێتە پێش.. ئەم لە ژنەکانی تر ناچێت، ئەم هەرگیز داوای یارمەتییەکی لەو جۆرەم لێ ناکات.

ئەوسا پێویستە قەشە دووربخرێتەوە.

چەندێک تاووتوێی مەسەلەکە دەکەم، جگە لەوە هیچ ڕێگەچارەیەکی تر نابینم. چما دەکرێ بهێنرێتەوە سەر ئەقڵ؟ دەکرێ وای لێ بکرێت تێ بگات کە ئیتر چ جۆرە مافێکی ئەوەی نییە کە ژیانی ئەو ژنە پیس بکات و دەبێ ئیدی ئازادی بکات؟ قسەی قۆڕ. ئەو ژنی ئەمە و ئەمیش مێردی ئەو. هەموو شتەکان ئەو مافەی لە بەرامبەر ویدا دەدەنێ: جیهان، خوا و ویژدانی خۆی. هەڵبەتە ئەڤین بۆ ئەم هەمان ئەو شتەیە کە بۆ لۆتەر بوو: پێداویستییەکی سروشتی کە خوای خۆی بۆ یەک جار و بۆ هەمیشە ڕووخسەتی پێ دا، کە

تەنیا بەم ژنە خۆی تێر کات. کە ژنەکە بە ساردی و بێ مەیلییەوە مامەڵە لەگەڵ حەزی ئەودا بکا، ئەوا هەرگیز بۆ ساتێکیش چییە بەرامبەر بەو "ماف"ەی خۆی دردۆنگی ناکات. وەکی تر دەشێ وا بیهێنێتە پێش چاوی کە ژنەکەی لەو ساتانەدا و لە دڵی خۆیدا هەمان هەستی ئەمی هەبێت، بەڵام ئەوە تەواوێک بە شتێکی ئاسایی دەزانێ کە ژنێکی مەسیحی و ژنە قەشەیەک تەنانەت لە دڵی خۆشیدا، شتێکی لەو جۆرە نەسەلمێنێ. هەتا بەشبەحاڵی خۆیشی بە تەواوی حەز ناکات ئەو شتە ناو بنێت چێژ، بگرە پێی خۆشە ناوی بنێت "ئەرک" و "ویستی خوا"... نا، ئەولاتر چێت، ئەم کابرایە ئەولاتر چێت، ئەولاتر!

ئەوە چۆن بوو: من بە دوای کرداریێکدا گەڕاوم و بە دوایدا هەوڵم داوە. کەواتە ئەمە کردارەکە – کردارەکەی منە؟ ئەمە ئەو کردارەیە کە دەبێ ئەنجام بدرێت، ئەو کردارەیە کە بە تەنیا وای دەبینم دەبێ ئەنجام بدرێ و هیچ کەسێک لە من زیاتر ناتوانێ و ناوێرێ ئەنجامی بدات؟

بۆی هەیە مرۆڤ بڵێ ئەمە نەختێک سەیر خۆ دەنوێنێت. بەڵام ئەمە بەڵگە نییە نە بۆ لەگەڵی و نە بۆ لە دژی. "گەورەیی" و "جوانی" لە مەسەلەیەکدا، بریسکەی پێچەوانەبوونەوەی کاریگەرییانن لەسەر خەڵک. بەڵام هەڵبەتە ئەمە مەبەستی بێ چەندوچوونی منە کە هەموو ئەوەی ناوی خەڵکە لە دەرەوەی ئەم شتەوە دابنرێت، ئەم گۆشەنیگایە نەهێنرێتە بەر باس. ئەمە شتێکە تەنیا بە خۆمەوە پێوەستە. من گەرە کمە کردارەکەم بە دووراوی ببینم، دەمەوێ بزانم لە ناوەوەڕا چۆن دەنوێنێ؟

بەر لە هەر شتێک: ئایا لە واقیعدا و هەر بە ڕاستی دەمەوێ قەشە بکوژم؟

"ویستن" – بەڵێ، مانای چییە؟ خواستی مرۆڤێک چ یەکەیەک نییە، بگرە سینتێزێکە لە سەدان موتیڤی هاودژ. سینتێزێک خەیاڵێکە ، خواست خەیاڵێکە. بەڵام ئێمە گەرەکمان بە خەیاڵە و هیچ خەیاڵێکیش لە ویستن بۆ ئێمە گرنگتر نییە. کەواتە: دەتەوێ؟

دەمەوێ و ناشمەوێ.

دەنگی هاودژ دێنە گوێم. من دەبێ لەگەڵیاندا بکەومە لێپێچینەوە، من دەبێ بزانم کە بۆچی ئەویان دەڵێ دەمەوێ و ئەمی تریان دەڵێ نامەوێ.

یەکەم جار تۆ کە دەڵێیت "دەمەوێ": بۆچی دەتەوێ؟

وەڵام بدەرەوە!

من دەمەوێت دەس بەکاربم. ژیان دەسبەکاربوونە. کاتێک شتێ دەبینم کە بێزارم دەکات، دەخاڵەت دەکەم. دەخاڵەت ناکەم گەر هەر جارێک مێشێک لە تەونی جاڵجاڵۆکەیەکدا ببینم، چونکە دنیای جاڵجاڵۆکەکان و دنیای مێشەکان دنیای من نین و دەشزانم کە مرۆڤ دەبێ خۆی سنووربەند بکات و منیش مێشەکانم خۆش ناوێن. بەڵام ئەگەر مێرووویەکی گچکەی جوان بە باڵی زێڕینی بریسکەدارەوە لە تەونەکەدا ببینم، ئەوا تەونەکە دەدڕێنم و گەر پێویست بکات جاڵجاڵۆکەکەش دەکوژم، چونکە پێم وانییە کە مرۆڤ نابێ جاڵجاڵۆکە بکوژێ.

بە دارستاندا دەڕۆم، دەنگێک دێتە گوێم داوای یارمەتی دەکات، بەرەوپیری قیژە و هاوارەکە دەڕۆم و پیاوێک دەبینم کە خەریکە لاقەی ژنێک دەکات. بێگومان بۆ ڕزگارکردنی ژنەکە هەرچیم لەدەست بێت دەیکەم و گەر پێویستیش بکات کابرا دەکوژم. یاسا چ مافێکی لەوبارەیەوە نەداوە پێم، یاسا تەنیا مافی ئەوەی داوەپێم کە لەمیانەی بەرگری لەخۆکردندا کەسێکی تر بکوژم، مەبەستی یاساش لە بەرگری لەخۆکردن تەنیا بەرگری لە ژیانی خۆ کردنە لەوپەڕی تەنگانەدا. یاسا ڕوخسەتم نادا کەسێک بکوژم تا باوکم یان کوڕەکەم یاخۆ هاوڕێ گیانی بەگیانییەکەم ڕزگار بکەم، هەروەها ڕوخسەتم نادا کەسێک بکوژم تا خۆشەویستەکەم لە توندوتیژی یاخۆ لاقەکردن بپارێزم. بە کورتی یاسا شتێکی مەسخەرەیە و هیچ مرۆڤێکی بە ویژدان لێ ناگەڕێ یاسا بڕیار لەسەر شێوازی ڕەفتاری بدات.

– بەڵام ئەدی یاسا نەنووسراوەکە؟ مۆراڵ...؟

– هاوڕێی ئازیز، خۆت وەک من باش دەزانیت کە مۆراڵ لە ڕەوشێکی

بزۆزدایە. مۆراڵ هەتا لەو ساتەوەختە خێرایانەی کە ئێمە لە دنیادا دەژین ڕووبەڕووی گـۆڕانکاریی دیار بووەتەوە. مـۆراڵ، ئەو بازنە بەناوبانگە بە تەباشیر کێشراوەی دەوراندەوری مامرەکەیە، ئەوە وابەستە دەکات کە باوەڕی پێیەتی. مۆراڵ تێڕوانینی خەڵکانی ترە لەبارەی ئەوەوە کە چی ڕاستە. بەڵام هەنووکە مەسەلەکە لەبارەی تێڕوانینی منەوەیە! ئەوە ڕاستە لە زۆر دۆخدا و ڕەنگبێ لە زوربەی زۆری ئەو دۆخانەدا کە زیاتر پێشـدێن، تێڕوانینی من کەمێک لەگەڵ تێڕوانینی ئەوانی تردا لەبارەی ئەوەوە کە چی ڕاستە، لەبارەی "مۆراڵ"ەوە، بێتەوە، لە زۆر دۆخی تریشدا تێڕوانینی خۆم لەگەڵ مۆراڵدا ناکۆک دەبینم و ئەو مەترسییانەش وەک ناکۆکییەک ئەوە ناهێنن وەدیار بخرێن، هەر بۆیە مل دەدەم. بەم شێوەیە مۆراڵ ئاگایانە بۆ من ئەوەیە کە لە پراکتیکدا بۆ هەمووان و بۆ هەر کەسێک چییە، گەرچی هەمووان ئەوە نازانن کە مۆراڵ یاسایەکی چەسپاو و بەر لە هەر شتێک گرێدەر نییە، بەڵام لە یاسای ڕۆژانەدا شێوە ژیانێکی بەسوودە لە ڕەوشی شەڕی نێوان خۆم و جیهاندا. من دەزانم و پێی لێ دەنێم کە ئەو مۆراڵە گشتییە و یاسای بۆرژوای لە هێڵە گشتییە بەرینەکانیاندا گوزارشت لە داد تێگەیشتنێک دەکەن کە بەری زەمـەنێکی لە مـەزەندە نەهاتووە و لە نەوەیەکـەوە بۆ نەوەیەکی تر ماوەتەوە، بە شێنەیی ئەزموونی سەبارەت بە هەلومەرجە پێویستترەکانی هاوژیانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا گەشە پێ کردووە و گۆڕیوە. دەزانم و ڕێزی لێ دەنێم کە ئەگەر ژیان بیەوێ بۆ مەخلووقاتێکی وەک ئێمەمانان لێرە لەسەر زەوی بەردەوام بێت، مەخلوقگەلێک کە جگە لە ڕێکخراوی کۆمەڵگە لە هیچ چوارچێوەیەکی تردا مەزەندە ناکرێن و بەو هەمـوو مافـە بگۆڕەی کتێبخانە و مۆزەخانە، پۆلیس و ئاوکێشی، ڕووناکی شەقامەکان، کۆکردنەوەی زبڵ و خاشاک، پاسەوانی، وەعزدان، ئۆپرای بالییە و هەتا دواییەوە لە دایکبوون. بەڵام من هەروەها دەشزانم ئەو خەڵکانەی چاوەڕێیان لێ دەکرێت هەرگیز ئەو یاسایانە زۆر بەوردی وەرناگرن. مۆراڵ پێوەندیی بە کەرەسەی ئاشپەزخانەوە هەیە نەک بە خواکانەوە، دەبێ بەکاربرێت، نەک

بسـەپێنرێت. دەبێ بە هـەڵسـەنگاندنەوە بـەکـاربـبـرێت، "بە نەخـتـێک وردە خـوێ"وە. شتێکی ئاقڵانەیە کە نەریت ببـرێتەوە ئەو جێگایەی کـە مرۆڤی لێـوە دێت. شـتێکی گەوجـانەیە ئەوە بە قـەناعـەتەوە بکرێت. من مـوسـافـیـرێکم لە دنیـادا، لـە نەریتی خـەڵکی دەنوێم و ئەوەیان وەردەگـرم کـە بەکـەڵکم دێت. مۆراڵیش لە "مـورێس"وە دێ، واتە خووەکان و بە تەواویی لەسـەر خوو و نەریت ڕۆنراوە و چ بناخەیەکی تری نییە. ئیدی چ پێویست ناکات فێرم بکەیت کە من لە مـیانەی کوشـتنی ئەو قەشەیەوە کارێک دەکەم کە دژی نـەریتە. مـۆراڵ- تۆ گاڵتە دەکەیت!

- ددان بەوەدا دەنێم کە من زیاتر پرسـیـارەکەم لـەبەر فـۆرمـە کـەی کـرد. پێموایە ئێمە سەبارەت بە مۆراڵ لەیەکتر تێ دەگەین. هەر لەبەر ئەوە وازت لێ ناهێنم. پرسـیارەکە لە سـەرەتاوە بە شـێوەیەکی جـەوهـەری ئەوە نەبوو تۆ چۆن دەوێریت ئەو شـتـە بکەیت کـە لەبـارەیەوە دەدوێـین، گـەرچی دژی نـەریت و مۆراڵیشـە، بگرە پرسیارە جەوهـەرییەکە ئەوەیە بۆچی گەرەکتە ئەوە بکەیت. تۆ بە بـەراوردکـارییـەک وەڵامت دامـەوە لەبـارەی پیـاوێکی بە زەبروزەنگ کـە لە دارستانێکدا لاقەی ژنێک دەکا. سەیر لەم بەراوردکارییە! لەلایەک تاوانبارێکی دڵڕەق و لەلاکەی تریشەوە قەشەیەکی پیری ئابڕوومەند و شایانی ڕێز!

- ئا، بـەراوردەکـە نەخـتـێک لەقـە. بەراوردکـارییـەکـە سـەبارەت بە ژن و پیاوێکی نەناس بـوو کە پێوەندییـەکی تەواو نەناسراویان لەنێـواندایە. مەعلووم نییـە ئاخـۆ ژنە نـەناسـەکە ئەوە دەهـێنێت مرۆڤ پیـاوێکی لەپێنـاودا بکوژێت، هەروەها مـەعلوومیـش نییـە پیاوە نەناسـەکە، کـە لە قـولاییی دارسـتـاندا بە ژنێکی گـەنج دەگات و لەناکـاوێکڕا پان(*) سواری سـەری دەبێ و دێوانە دەبێ، دەهێنێ بکوژرێت. دواجـاریش مـەعلووم نییـە ئاخـۆ مـەترسـییـەکی ئاوها لە ئارادایە کە پێویست بە دەخاڵەتێکی لەو جۆرە بکات! کیژەکە دەقیژێنێ چونکە

(*) Pan: لە میتۆلۆگیای گریکیدا خواوەندی دارستـان و داهێنەری بلوێری شوانانە. و. کوردی.

دەترسێ و ئازاری دێت، بەڵام ناکرێ بگوترێ دەبێ زەرەرمەندییەکەی بە قیژەکەی بپێورێت. دەکرێ ئەو دووانە بەر لەوەی جیاببنەوە بۆ یەکدی ببنە هاوڕێی باش. لە دەرەوەی شار زۆر هاوسەرگیری بە لاقەکردن دەستی پێ کردووە و لەوانی تر خراپتریش دەرنەچوون، کیژ رفاندن رۆژێک لە ڕۆژان ئەو شێوازە ئاساییە بووە بۆ دەسگیران بوون و هاوسەرگیری. واتە من ئەگەر لەم نموونەیەدا کە هەڵم بژاردووە، پیاوەکە بکوژرێ تا ژنەکە ڕزگار بکرێت- شێوە کردارێک پێم وایە زۆربەی خەڵکانێک کە مۆراڵییانە بیردەکەنەوە، جگە لە دادناسان، پێیان خۆش دەبێت، خۆ گەر لەبەردەم دەستەی دادوەرانێکی فەڕەنسایی یان ئەمریکاییدا ڕابگیرێم، ڕەنگ بێ رێک و ڕەوان هاوئاهەنگ لەگەڵ چەپڵەڕێزانی ئامادەبوواندا ئازاد بکرێم- کارێکی تەواو خۆکردم کردووە بەبێ ڕاوێژکردن و ڕەنگە گێلێتییەکی گەورەش بێت. بەڵام مەسەلەکەی ئێمە تەواوێک جیاواز هەڵکەوتووە. لێرەدا پرسیارەکە لەبارەی مەسەلەیەکی تاکوتەرای لاقەکردنەوە نییە، بگرە لەبارەی پێوەندییەکەوەیە کە ژیان و مردنی تێدا مەترەحە و لە جەوهەردا بریتییە لە لاقەکردنێکی دووبارە و بەردەوام. لێرەدا مەسەلەکە پیاوێک نییە بە بەهایەکی نائاشناوە، بگرە مەسەلەکە پیاوێکە کە تۆ زۆر باش دەیناسیت: ئەویش قەشە گریگۆریۆسە. لێرەدا مەسەلە یارمەتیدان و ڕزگارکردنی ژنێکی نائاشنا نییە، بگرە مەسەلە دولبەرە نهێنییەکەتە...

- نەء، بێدەنگ ، بەسە، بێدەنگ بە...!

- ئاخۆ پیاوێک لێ دەگەڕێ ئەو کەسەی خۆشی دەوێت لەبەر چاوانیدا سوکایەتیی پێ بکرێت و پیس بکرێ و ژێر پێ بنرێ؟

- بێدەنگ بە! ئەو ژنە کەسێکی تری خۆش دەوێت. ئەمەش کێشەی خۆیەتی نەک من.

- خۆت دەزانیت تۆ ئەوت خۆش دەوێ. کەواتە کێشەی تۆیە.

- بێدەنگ بە!... من پزیشکم. تۆیش دەتەوێت بە نهێنیی پیرەمێردێک

بکوژم، که هاتووه بۆ لام تا داوای یارمەتیم لێ بکات!

– تۆ پزیشکیت. ئاخۆ تا ئێستا ئەم دەربڕینەت بە زاردا نەهاتووە: ئەرکی من وەک پزیشکێک! دەی فەرموو ئێستا ئەوە ئەرکەکەت: من پێم وایە ئەوە شتێکی ڕۆشنە. ئەرکی تۆ وەک پزیشکێک یارمەتیدانی ئەو کەسەیە کە دەکرێ و دەبێ یارمەتی بدرێت، بڕینی ئەو لووە پیسەیە کە زەرەر لە تەندورستیی دەدات، دیارە چ شانازییەک لەوەدا نییە گیربهێنرێیت: نابێ لێ گەڕێیت کەس بەوە بزانێت، ئەوسا لە لۆنگهۆلم یان کونرادسبێری توند دەکرێیت.

هەنووکە وەبیرم دێتەوە دوای ئەوە شنەبایەک لەناکاوێکڕا پەردەکەی بەرەو مۆمەکە برد و چمکەکەی ئاگری گرت، بەڵام ئەو بڵێسە شینە گچکەیەم بە دەست کوژاندەوە و پەنجەرەکەم داخست. من ئەو شتانەم بە تەرزێکی خۆکردانە و بەبێ چ ئاگاییەک کرد. باران قامچی بە شووشەی پەنجەرەکەدا دەدا. مۆمەکان هێور و نەبزووت دەسووتان. شەوە پەپوولەیەکی خۆڵەمێشی پەڵەڕەنگ بەسەر یەکێکیانەوە نیشتبووەوە.

دانیشتم و لە بڵێسە نەبزووتەکانی مۆمەکان ورد دەبوومەوە و وەک بڵێی لەوێ نەمابم. پێم وایە ڕۆچووبوومە جۆرە خەوێکی قووڵەوە. ڕەنگە بۆ ساتێک خەوم لێ کەوتبێ. بەڵام کتوپڕ وەک ئەوەی شۆکێکی توند لێی دابم، ڕاچڵەکیم و هەموو شتێکم بیرهاتەوە: پرسیارێک کە دەبێ یەکلایی بکرێتەوە، بڕیارێک کە دەبێ بدرێت بەرلەوەی بتوانم بحەوێمەوە.

دەی تۆ کە ناتەوێت: باشە بۆچی ناتەوێت؟

– من دەترسم. بەر لە هەر شتێک لە ئاشکرابوون و لە "سزا" دەترسم. من دڵسۆزی و ژیریی تۆ بەکەم ناگرم، هەڵبەت پێم وایە بە جۆرێک ڕێکی دەخەیت کە بە باشی بەڕێوە بچێت. من زۆر بە شتێکی شیاوی دەزانم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەترسییەکە لەوێدایە. ڕێکەوت... بنیادەم هەرگیز نازانێت چ ڕوودەدا.

– بنیادەم دەبێ بتوانێ لەم دنیایەدا ڕیسک بە شتێکەوە بکات. تۆ

دەتویست کارێک بکەیت. بیرت چووەتەوە چەند هەفتەیەکی کەم لەمەوبەر، هێشتا هیچ شتێکمان لەبارەی هەموو ئەم شتانەوە نەدەزانین کە پاشان هاتن، چیت لە دەفتەری یاداشتەکانتدا نووسی؟ نووسیت: پلەوپایە. ناوبانگ، داهاتوو. ئامادەبوویت هەموو ئەو شتانە لەو یەکەمین کەشتییەدا بپێچییەوە کە بە کردارێک بار دەکرێت... بیرت چووەتەوە؟ دەتەوێ ئەو لاپەڕەیەت پیشان بدەم؟

– نەء. بیرم نەچووەتەوە. بەڵام ئەوەم بە ڕاست نەبوو، بگرە لاف لێدان بوو. هەنووکە کاتێک کەشتییەکە دەبینم دێت، هەست بە شتێکی جیاواز دەکەم. هەڵبەت تۆ دەتوانیت تێ بگەیت کە من بیرم بۆ کەشتییە تارماییەکی ئاوها شەیتانانە نەچووبوو! ئەوە لاف لێدان بوو! ئەوە درۆ بوو! کەس گوێی لێمان نییە، دەتوانم ڕاستگۆیانە لەگەڵتدا بدوێم. ژیانم بەتاڵ و ناخۆشە و چ مانایەکی تێدا نابینم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێیەوە لکاوم، حەزدەکەم بچمە بەر هەتاو و لە خەڵک بنۆڕم، نامەوێت شتێکم هەبێت بیشارمەوە و لێی بترسم، لێم گەڕێ با ئاسوودە بم!

– ئاسوودە، نەء – لەگەڵ ئەوەشدا ئاسوودە نابیت. گەرەکتە ئەو کەسەی خۆشم دەوێت ببینم لە گۆمۆکەیەک پیسیدا دەخنکێ، لەکاتێکدا کە دەتوانم بە وەخۆکەوتنێکی ئازایانە و خێرا یارمەتیی بدەم و دەری بێنم– ئەدی ئەوە ئاسوودەییە. چما قەت ئاسوودە دەبم گەر پشتی تێ بکەم و بچەمە دەرەوە بۆ بەر هەتاو و تەماشای خەڵک بکەم؟ توخوا ئەوە ئاسوودەییە؟

– من دەترسم. زۆر لە ئاشکرابوون ناترسم، ئاخر من هەمیشە حەپەکانم هەن و هەرکاتێ سووسەی مەسەلەکە بکرێت، دەتوانم بە قووتدانی یەکێک لەو حەپانە لە یارییەکە بچمە دەرەوە، بەڵام من لە خۆم دەترسم. ئەدی من چی لەبارەی خۆمەوە دەزانم؟ من دەترسم لە شتێکەوە بگلێم کە بمبەستێتەوە و بەگیرم بهێنێ و چی دی بەرم نەدات. ئەوەی تۆ لە منی دەخوازیت لەگەڵ هیچ شتێک لە بۆچوونەکانی مندا ناکۆک نییە، ئەوە کارێکە هەر کەسێکی تر بیکات پەسەنی دەدەم بەو مەرجەی ئەوەم زانیبا کە دەیزانم، بەڵام ئەوە بۆ من

ناگونجێ. هاودژە لەگەڵ هەوەس و نەریت و غەریزەکانی مندا، هاودژە لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا کە جەوهەری منن. من بۆ شتێکی ئاوها دروست نەبووم. هەزاران زەلامی گورجوگۆڵ و زلحۆرت هەن کە بەهەمان هاسانی کوشتنی مێشێک، زەلامێک دەکوژن، ئەدی بۆچی یەکێک لەوانە ئەمە نەکات؟ من دەترسم ویژدانم ئازارم بدات، مرۆڤ دووچاری ئازاری ویژدان دەبێت کاتێ هەوڵ بدا لە پێستی خۆی درزە بکاتە دەرێ. "داسەکنین لە پێستی خۆتدا" واتە ناسینی سنوورەکانی خۆت: من گەرەکمە لە پێستی خۆمدا داسەکنێم. خەڵکی رۆژانە زۆر بە هاسانی و بەوپەڕی هەوەسەوە دژی راستگۆترین و ڕەواترین بۆچوونەکانیان مامەڵە دەکەن و ویژدانیشیان وەک ماسی ناو ئاوە، بەڵام هەوڵ بدە لە دژی هەرە ناوەوەترین ستروکتورەکانت مامەڵە بکە، ئەوسا دەبیستیت کە چۆن ویژدانت دەقیژێنێت! دەبێتە مۆسیقای پشیلە! تۆ دەڵێیت من سواڵ و داوای کارکردنێکم کردووە – ئەوە مەحاڵە، ئەوە ڕاست نییە، دەشێ ئەوە جۆرە بەدحاڵیبوونێک بێت. ناچێتە ئەقڵەوە ئارەزوویەکی ئاوها شێتانەم هەبووبێ– من بۆ بینەری لەدایکبووم، من دەمەوێ لە لۆجێکدا پاڵ بدەمەوە و تەماشا بکەم کە چۆن خەڵک لەسەر شانۆ یەکتر دەکوژن، بەڵام من بۆ خۆم هیچ پێوەندیم بەوێوە نییە، من گەرەکمە لە دەرەوە بم، لێم گەڕێ با لە ئاسوودەییدا بم!

– زبڵ! تۆ زبڵیت!

– من دەترسم. ئەمە مۆتەکەیەکە. من چی بکەم لەگەڵ ئەم خەڵکە و کاروبارە پۆخڵەکانیان! ئەم قەشەیەم هێندە پێ ترسناکە کە لێی دەترسم... من نامەوێ چارەنووسم هیچ جۆرە تێکەڵاوبوونێکی لەگەڵ چارەنووسی ئەودا هەبێت. ئەدی من چی لەبارەیەوە دەزانم؟ ئەوەی نەفرەتم دەوروژێنێ "ئەو" خۆی نییە، بگرە ئەو کاریگەرییەیە کە لەسەرم جێی هێشتووە – ئەو بە دڵنیاییەوە بە سەدان و هەزاران خەڵکی تر گەیشتووە بەبێ ئەوەی هەمان ئەو کاریگەرییەی کە لەسەر من جێی هێشتووە، لەسەر ئەوانی جێ هێشتبێت. ئەو وێنەیەی ئەو لەسەر ڕۆحم جێی هێشتووە بە دیارنەمانی وی لەناوناچێت،

بەتایبەتیش ئەگەر دیارنەمانەکەی دەستی منی تێدابێت. ئەو ئێستا بە زیندوویی هێندە "ئەفسوون"ی کردبم، کێ چوزانێ بە مردوویی چیم پێ دەکات؟ من ئەم شتە دەناسم، من راسکۆلیکۆف(*)م خوێندووەتەوە، من تێریسێ ڕاکوینم خوێندۆتەوە، من باوەڕم بە تارمایی نییە، بەڵام ناخوازم کارێک بکەم کە بڕوای پێ بهێنم. ئەرێ من هەقم بەسەر هەموو ئەم شتانەوە چییە؟ من دەمەوێ بۆ دوور سەفەر بکەم. من گەرەکمە دارستان و شاخ و ڕووبارەکان ببینم. گەرەکمە بە کتێبێکی بەرگی بچووکی جوان تێگیراوەوە لە گیرفاندا، بەژێر درەختە سەوزە گەورەکاندا بڕۆم و بیر لە شتی جوان و باش و ئارام بکەمەوە، بیرێک بکەمەوە کە بە دەنگی بڵند بگوترێ و مرۆڤی پێ بەنێوبانگ ببێ. لێم گەڕێ، وازم لێ بێنە سبەینێ بڕۆم...

– زبڵ!

مۆمەکان بە بڵێسەی پیسی سوورەوە لە ڕووناکیی خۆڵەمێشیی کازیوەدا دەسووتێن. شەوەپەپوولەکە بە باڵی سووتاوەوە لەسەر مێزی نووسینەکە کەوتووە.

خۆم فڕێ دایە سەر سیسەمەکە.

### ٨ی ئۆگۆستی

وەک جاران ئەسپسواری و مەلەم کرد، پێشوازیم لە نەخۆشەکانم کرد و سەردانیانم کرد. ئێوارەش گەڕامەوە. من ماندووم.

بورجە خشتینەکەی کڵێسا لەبەر هەتاوی ئێوارەدا زۆر سوور دەبینرێت. پۆپکی سەوزی درەختەکان بەتایبەتی لە ئێستادا زۆر گەورە و تاریکن و شینایییەکەی پشتەوەیان گەلێک قووڵ. ئێوارەی شەممەیە، منداڵانی گچکە و هەژار لە خوارەوە لە باریکەڕێ لمینەکەدا خەتخەتێن دەکەن. لە پەنجەرەیەکی کراوەدا پیاوێک کراسێکی قۆڵداری لەبەردایە و دانیشتووە و فلووت دەژەنێت،

(*) پاڵەوانی ڕۆمانی (سزا و تاوان)ی دۆیستۆڤیسکی.

بڕگەیەک لە کاڤاللێریا ریوستیکانا دەژەنێت. میلۆدییەکان و کاریگەرییان شتێکی عەنتیکەیە. بەحاڵ بەر لە دە ساڵ لەمەوبەر ئەم میلۆدییە لە فەوزاوە هەڵگۆزرا و دزەی کردە نێو مۆسیقاژەنێکی هەژاری ئیتاڵییەوە، دەشێ ئێوارەیەک لە ئەنگۆرەدا، ڕەنگە لە ئێوارەیەکی وەک ئەم ئێوارەیەدا، ئەو مۆسیقایە ڕۆحی ویی پێتاند، میلۆدی تر و ڕیتمی تری بەدوادا هات و لەگەڵیدا یەکانگیربوون و لەماوەیەکی کەمدا بووە مۆسیقاژەنێکی بەناوبانگی جیهانی و ژیانێکی نوێیان بە شادمانی و غەمی نوێوە پێ بەخشی و سەروەتێکیش کە لە مۆنتێ کارلۆ دۆڕاندی. میلۆدییەکەش وەک پەتایەکی ناکاو هەموو دنیا دەگرێتەوە و ئەوەی لە چارەی نووسراوە لە باش و خراپ ئەنجامی دەدا، گۆناکان سوور هەڵدەگەڕێنێ و چاوەکان دەخاتە درەوشە، خەڵکانێکی زۆر ستایشی دەکەن و خۆشیان دەوێ و ئازار و نەفرەتیش لای هەندێک کەسی تر دەوروژێنێت، بەتایبەتی لای ئەو کەسانەی کە یەکەمجار خۆشیان ویست، شەوانە پێچەقێن و دڵڕەقانە لە گوێی خەو لێزڕاواندا دەزرنگێتەوە، ئەو بازرگانە قەڵس دەکات کە راکشاوە و گینگڵ دەدات بەوەی ئەو سەهمانەی کە هەفتەی ڕابردوو فرۆشتوونی، هەنووکە نرخیان بەرزبووەتەوە، ئەو بیرمەندە ئازار دەدا و بێزاری دەکات کە گەرەکییەتی بیری خۆی بۆ فۆرمۆڵەکردنی یاسایەکی نوێ چڕ بکاتەوە، یاخۆ لە پانتاییی چۆڵی مێشکێکی گێلدا سەما دەکات. هاوکات دەشێ ئەو پیاوە لە هەر کەسێکی تر زیاتر ئازاری پێ بچێژێ و ئەزیەتی پێ بخوات کە خوڵقاندوویەتی، هێشتا ئێوارەی لەسەریەک هەرای هاڕەی چەپڵەی بینەران دێتە گوێ کە لە هەموو جێگەکانی نواندن لە جیهاندا بۆی لێ دەدرێت، ئەو پیاوەش لە دوورەوە، بە هەست و سۆزەوە بە فلووتەکەی دەیژەنێت.

## ٩ی ئۆگۆستی

خواستن واتە بتوانیت هەڵبژێریت. ئاه، کە چەندێک قورسە هەڵبژاردن!

کە بتوانیت هەڵبژێریت واتە بتوانیت خۆت فیدا بکەیت. ئاه، کە چەندێک

قورسە خۆفیداکردن!

شـازادەیەکی گـچکە دەیویسـت گـەشـتـێک بکات، لێـیـان پرسـی: شـازادە حـەزدەکـا بە ئەسپ بڕوات یان بە بەلەم؟ ئەویش وەڵامـی دانەوە: دەمـەوێ بە سواری ئەسپ بڕۆم و بە بەلەم سەفەر بکەم.

ئێـمـە هـەمـوو شـتـێکمـان دەوێ، دەمـانەوێ ببینە هـەمـوو شـتـێک، هـەمـوو ئارەزووی بەختـەوەری و هـەمـوو قووڵاییـی عەزابێکمان دەوێ. شـەوق و شـۆری کارمان دەوێ و ئارامیی بینین. هەردوو بێدەنگیی بیابان و زەنگی دووانگەمان دەوێ. لەیـەک کـاتدا ئەندێشـەی تاک و دەنگی خـەڵک بین، دەمـانەوێ ببـینە هەردوو میلۆدی و نۆتەدەنگ. لەیەک کاتدا! ئەوە چۆن دەبێ!

"گەرەکمە بە سواری ئەسپ بڕۆم و بە بەلەم سەفەر بکەم".

## ١٠ی ئۆگۆسـتی

کـاتژمـێـرێکی بێ مـیـل شـتـێکی وشک و بەتاڵە کـە ڕوخـسـاری مـردوو وەبیـردێنێتـەوە. من ئێسـتـا دانیشـتووم و لە کـاتژمێرێکی ئاوها دەنۆڕم. خـۆی ئەوە کـاتژمـێر نیـیـە، بگرە تـەنیا کـیـفی بەتاڵی کـاتژمـێرێکە بە سـەرقـاپێکی دێرینی جـوانەوە. تازەکی کـاتێ لەم خـۆرئـاوابوونە گـەرم و زەردەدا بۆ مـاڵەوە دەهـاتمـەوە – خـۆرئـاوابوونێکی سـەیر کـە پێم وایە کۆتاییی ڕۆژ لە بیـاباندا بەو شـێوەیـەیە– ئەوەم لە جامـخـانەی سـەعاتچییـە پشتکۆمەکەی کۆڵاندا بینی... چوومـە دوکانی سـەعاتچییەکەوە کە جارێکیان کـاتژمێرەکەمی چاک کردەوە، لێم پرسی ئەوە چ کاتژمێرێکە کە هیچ میلێکی نەبێت. ئەو بە زەردەخەنە کۆمە عیشـوەگەرانەکەیەوە، ئەو سـەرقـاپە زیوە جـوانە دێرینەی پیشـان دام، شـتـێکی جـوان بوو، ئەوەی لە هـەراجـخـانەیەک کـڕیبـوو، بەڵام مـیکانیـزمـەکەی بەکـەڵک نەمـاو و لەکار کـەوتبـوو، بەنیازبـوو یەکێکی تازەی بۆ دانـێ. من ئەو سـەرقـاپەم وەک خۆی کڕی.

بەنیـازم چەند دەنکێک لە حـەپەکانی بخەمـە ناو و لە گیرفانی لای ڕاسـتی

هێلەکەکەمدا وەک کاتژمێر هەڵی بگرم. ئەمە ئەڵتەرناتیڤێکی نوێی بیرۆکەکەی دێمۆستێن(*)ە بە هەڵگرتنی ژەهر لە پاندانیدا. هیچ شتێک نوێ نییە لەژێر خۆردا!

***

ئێستا شەوە، ئەستێرەیەک پێشوەخت لەنێو گەڵای دارکەستانە گەورەکەوە دەدرەوشێتەوە. هەست دەکەم ئەمشەو دەتوانم باش بنووم، مێشکم ئارام و ئاسوودەیە. لەگەڵ ئەوەشدا پێم زەحمەتە خۆم لە درەخت و ئەستێرەکە دابڕم.

شەو! وشەیەکی زۆر جوانە! گالێر(**)ە دێرینەکان دەڵێن شەو لە ڕۆژ کۆنترە. ئەوان پێیان وابوو کە ڕۆژی کورت و فانی لە شەوی بێکۆتا بووە.

ئەو شەوە گەورە بێ کۆتاییە.

ئێ، ئەمە ئێستا تەرزێکی قسەکردنە... ئەدی شەو چییە، ئەو شتە چییە کە پێی دەڵێین شەو؟ سێبەرێکی باریکی لوولەکیی کەوکەبە گچکەکەمانە. لوولەکێکی گچکەی تیژە لە تاریکی لە نێوەندی زەریایەک ڕووناکیدا. ئەدی ئەم زەریا ڕووناکییە چییە؟ پزیسکێکە لە فەزادا. بازنەیەکی گچکەی ڕووناکییە بەدەوری ئەستێرەیەکی گچکە: بە دەوری خۆردا.

ئاە، ئەمە چ تاعوونێکە دووچاری خەڵک بووە کە لەبارەی هەموو شتێکەوە بپرسن ئەمە چییە؟ ئەمە چ بەڵایەک بوو کە خەڵکی بە قامچی لەنێو خوشک و براکانیدا لە بوونەوەری خشۆک و پیادەڕەو و ڕاکردە و هەڵگژەر و فڕندە لەسەر ئەرز وەدەرنان، تا لە سەرەوە و لە دەرەوە بە چاوانێکی سارد و نامۆوە

---

(*) Demostenes: (٣٢٢– ٣٨٤) پ.ز دەسەڵاتدارێکی ئاتینییە و ناوبانگی بەو نوتقانەوەیە کە دەیدا تا ورە بداتە بەر هاوڵاتیانی بۆ بەرگریکردن دژی فیلیپی مەکەدۆنی. دواجار لە شەڕێکدا بەزێنرا و ناچاربوو هەڵبێ و پاشان بە ژەهر خۆی کوشت. و. کوردی

(**) galler: ئەندامی خێڵێکی کێلتی لە سەردەمی دێرینی گاللێندا. بە تایبەتی لە فەرەنسا و باکوری ئیتاڵیا ژیاون. و. کوردی

لە جیهانەکەی خۆی و لە ژیانی خۆی بنۆڕێت و بۆی دەرکەوێت کە چەندێک گچکە و بێ بەهایە؟ بەرەو کوێ دەچین؟ چۆن کۆتاییی دێت؟ من دەبێ گوێ بۆ ئەو دەنگە ژنانەیە ڕادێرم کە لە خەونمدا بیستم، هێشتا لە گوێمدا دەیژنەوم، دەنگێکی دێرین و گریاناویی ژنانە کە دەڵێ: وا دنیا دەسووتێ، وا دنیا دەسووتێ!

تۆ دەبێ لە گۆشەنیگای خۆتەوە لە دنیای خۆت بنۆڕیت نەک لە گۆشەنیگایەکی بیر لێکراوەوە لە فەزادا، تۆ دەبێ شەرمنانە بە پێوانەی خۆت و بە ڕەوش و هەلومەرجی خۆت ڕەوش و هەلومەرجی ئینسان- ڕەوش و هەلومەرجی زەویساز بپێویت. ئەوسا زەوی بە ئەندازەی پێویست گەورەیە و ژیانیش شتێکی گرنگ، شەویش بێ کۆتایی و قووڵ.

### ١٢ی ئۆگۆستی

ئەم ئێوارەیە خۆر چەندە جوان بەسەر کەڵەشێری میتاڵیی کڵێساکەدا پرشنگ دەدا!

من هەمیشە خۆشیم بەو پەلەوەرە ژیرە جوانە هاتووە، کە بەردەوام بە با دەخولێتەوە. هەمیشە ئەو کەڵەشێرەم وەبیردێنێتەوە کە لە کاتێکی دیاریکراودا سێ جاران دەقووقێنێ، ئەوە سیمبولێکی هونەرمەندانەیە بۆ کڵێسای پیرۆز کە بە حاشا لێکردنی وەستاکەی دەژی.

لە حەوشەی کڵێسادا سەرەک قەشەی فیرقە مەزهەبییەکە، کە خۆی بە باسکی برا قەشەیەکی گەنجترەوە گرتووە، لەو ئێوارە خۆشەی هاویندا بەکاوەخۆ پیاسە دەکات. پەنجەرەکەم کراوەتەوە، دنیا هێند ئارامە کە هەر وشەیەک لە زاریان دێتە دەرێ، دەگاتە سەرەوە بۆ ئێرە. ئەوان لەبارەی هەڵبژاردنە نزیکەکەی ئوسقوفی گەورەوە دەدوێن، گوێم لێ بوو سەرەک قەشە ناوی قەشە گریگۆریۆسی بە زاردا هات. ناوەکەی بێ هیچ جۆرە خۆشحاڵییەک و بەبێ چ هەستێکی ئامێتە بە دڵسۆزیی هێنا. گریگۆریۆس لەو

قەشانەیە کە هەمیشە خەڵکانی ئاساییان لەپشت بووە و وەک بەرئەنجامی ئەوەش برا خاوەن پلەوپایەکانیشی لە دژ بوون. بە تۆنی دەنگەکەیدا کە گوێم لێ بوو، سەرەک قەشە زیاتر بە شێوەیەکی ڕاگوزەری ناوەکەی ویی دەهێنا و پێی وانەبوو کە ئەو شانسێکی ئەوتۆی لە بردنەوەدا هەبێت.

منیش هەمان ڕام هەیە. پێم وایە ئەو شانسێکی ئەوتۆی لەبەردەمدا نییە. زۆرم پێ سەیر دەبێت ببێتە ئوسقوفی گەورە.

ئەمڕۆ ١٢ی ئۆگۆستییە، ٤ یان ٥ی یولی ئەو سەفەری کرد بۆ پورلا و دەبێ شەش هەفتە لەوێ بێت. کەواتە ڕۆژانێکی زۆر ناخۆشی دەبێت کە لێرە دوای گەشتی کەنار زەریاکەی، چالاک و بەڕەنگوبۆ پەیدا دەبێتەوە.

## ١٣ی ئۆگۆستی

چۆن دەبێ کارەکە ئەنجام بدرێت؟ ماوەیەکی زۆرە ئەوە دەزانم. ڕێکەوت وای کرد کە کێشەکە بۆ خۆی یەکلایی بێتەوە: ئەو حەپە سیانکالیۆمانەی جارێک لە جاران بە جوانی ئامادەم کردوون و لەکاتی ئامادەکردنیاندا جگە لە خۆم بیرم لای کەسی تر نەبووە، ئیدی هەڵبەت ڕۆڵی خۆیان دەبینن.

شتێک بەڵگەنەویستە: ئەویش ئەوەیە نابێ بهێڵم لەماڵەوە لای خۆی قووتی بدات. دەبێ لای من ئەوە ڕوو بدات. ئەوە شتێکی خۆش نییە، بەڵام چ ڕێگەچارەیەکی ترم نییە و دەشمەوێ کۆتایی بەمە بهێنم. ئەگەر حەپەکە لە ماڵەوە لای خۆی بەپێی ڕەچەتە و داوای من دەسبەجێ دوای ئەوە قووت بدا، ئەوا ترسی ئەوە هەیە کە دەشێ پۆلیس پێوەندییەک لە نێوان ئەو دوو فاکتەدا دروست بکات، سەرباری ئەوەش ئەو کەسەی گەرەکمە ڕزگاری بکەم، ببێتە جێی گومان و بە درێژاییی ژیانی لە تاوانەوە بگلێ و ڕەنگیشە بە تاوانی کوشتن حوکم بدرێ.

هەڵبەت نابێ هیچ شتێک بەو شێوەیە ڕووبدات کە پۆلیس خانەگومان بکات. کەس نابێت بزانێت کە قەشە حەپی دراوەتێ: ئەو دەبێ مردنێکی تەواو

سروشتی، بە سەکتەی دڵ بمرێت. تەنانەت خاتوونیش نا بێ سووسەی هیچ شتێکی تر بکات. گەر لای من بمرێت هەڵبەت بۆ ناوبانگم وەک پزیشکێک کەمێک کوشندەیە و رەنگە بۆ هاورێکانم ببێتە کەرەستە بۆ گاڵتە پێکردنم، بەڵام قەیدی ناکات.

ڕۆژێک دێت بۆ لام و لە بارەی دڵییەوە یان هەر گەندوگوویەکی تریەوە دەدوێ و دەیەوێت دڵنیا بکرێتەوە کە ئاخۆ دوای گەشتەکەی بۆ کەنار زەریا، تەندروستیی باشتر بووە.. کەس ناتوانێ گوێی لێمان بێت ئێمە باسی چ دەکەین، هۆڵە گەورەکە دەکەوێتە نێوان ژووری چاوەڕوانی و ژووری پێشوازیکردنمەوە لە نەخۆش. گوێ ڕادەدێرم و دەست بە دڵیدا دەکێشم، بۆی ڕوون دەکەمەوە کە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش باشتر بووە، بەڵام بەهەرحاڵ شتێکی تر هەیە کە کەمێک دردۆنگم دەکا... حەپەکانم دەردەهێنم و پێی دەڵێم ئەمە دەرمانێکی تازەیە دژی هەندێک نەخۆشی دڵ (هەڵبەت ناوێک لە حەپەکان دەنێم) و ئامۆژگاری دەکەم کە هەر ئێستا دانەیەکی لێ بخوات. پەرداخێک شەرابی شیرینی دەدەمێ تا لەگەڵ حەپەکەدا هەڵی قورێنێ. چما شەراب دەخواتەوە؟ ئا بێگومان، لە خۆیم بیستووە کە لەو بارەیەوە پشتی بە زەماوەند لە کانا(*) قایمە... کەمێک شەرابی باش دەخواتەوە. گرۆنستێدتس گرۆدئاسک. دەیهێنمە پێش چاوی خۆم: یەکەمجار لێو بە شەرابەکە تەڕ دەکا، پاشان حەپەکە دەخاتە سەر زمانی، پەرداخەکە هەڵدەقورێنێ و حەپەکە قووت دەدا. چاویلکەکەی، پەنجەرە و ئینجانەی گوڵە فیکوسەکە پێچەوانە دەکاتەوە و نیگای دەشارێتەوە... من پشتی تێ دەکەم، بەرەو لای پەنجەرەکە دەڕۆم و تەماشای قەبرسانەکە دەکەم، ڕادەوەستم و بە پەنجە لە شووشەی پەنجەرەکە دەدەم... ئەو شتێک دەڵێ، بۆ نموونە دەڵێ شەرابەکە خۆش بوو، بەڵام ڕستەکە

(*) زەماوەند لە کانا: کانا یان قانا ناوچەیەکی ئینجیلییە لە جەلیل، مەسیح یەکەم موجیزەی خۆی لەوێ نواند. زەماوەند لە کانا، زەماوەندێک کە مەسیح تیایدا شەرابی خواردەوە. ئەو ڕووداوە بووەتە ئیلهامی یەکێک لە هەرە بەناوبانگترین تابلۆکانی نیگارکێشی بە ڕەچەڵەک کریتاییی ئێل گریکۆ. و. کوردی

تەواو ناکات... تەپەیەک دەژنەوم... لەسەر ئەرزەکە دەکەوێ...

بەڵام ئەی ئەگەر نەیەوێت حەپەکە بخوات؟ ئۆە، وەک شتێکی بەتام دەیخوات، ئەو شێت و شەیدای دەرمانە... بەڵام ئەی ئەگەر؟ ئا، ئەوسا من هیچم لەدەست نایەت، دەبێ چاوی لێ بپۆشرێ، خۆ ناتوانم بە تەورێک بیکوژم.

... لەسەر ئەرزەکە دەکەوێت. قوتووی حەپ و شووشەی شەراب و پەرداخەکە کۆ دەکەمەوە. زەنگ بۆ کریستین لێ دەدەم و کە دێت پێی دەڵێم: قەشە نەخۆشە، بووراوەتەوە، هەر ئێستا دێتەوە سەر خۆی، نەبزی دەگرم و گوێ لە لێدانی دڵی ڕادەدێرم، دواجار دەڵێم: سەکتەی دڵە. مردووە.

تەلەفۆن بۆ هاوکارێکم دەکەم. ئا، بەڵام بۆ کێ؟ ئا با بیربکەمەوە. ئەمەیان بە کەڵک نایەت، حەوت ساڵ لەمەوبەر تێزێکی نووسی کە من لە کۆوارێکی سەندیکای پزیشکاندا ڕەخنەم لێ گرت... ئەمەشیان هەر زۆر زیرەکە. ئەمەیان و ئەوەیان و ئەمەیان و ئەوەیان: سەفەریان کردووە. ئەمەیان: ئا، ئەمەیان باشە. یان ئەوەیان، یاخود قیروسیا ئەوەیان.

دەچمە بەر دەرگای ژووری چاوەڕوانی، دەشێ بە ڕەنگپەڕیوییەکی گونجاو، بە دەنگێکی نزم و بەسەرخۆدا زاڵبوو، بۆ نەخۆشەکانی ڕاڤە بکەم کە شتێک ڕووی داوە و ناچارم ئەمڕۆ هیچ نەخۆشێک نەبینم.

هاوکارەکەم دێت، بۆی ڕوون دەکەمەوە کە چی ڕووی داوە: قەشە ماوەیەکی زۆرە نەخۆشییەکی قورسی دڵی هەیە. هاوکارەکەم میهرەبانانە بۆ ئەو بێ شانسییەی کە ئەوە لە سەرەوە لە لای من ڕووی داوە، دڵنەواییم دەکا و لەسەر داوای من گەواهینامەی مردنەکە دەنووسێ.. نا، من چ شەرابێک نا دەمە قەشە، دەشێ بە خۆیدا بیرێژێ یان بۆنی بکرێ کە شەرابی خواردووەتەوە، ئەوەش شتێکی زەحمەتە ڕاڤە بکرێت... پەرداخێک ئاوی بەسە. وێڕای ئەوەش پێم وایە شەراب زەرەرمەندە.

بەڵام ئەی ئەگەر مەسەلەکە بێتە سەر توێکاریی لاشەکەی؟ ئا، ئەوسا من

خۆیشم حەپێک دەخۆم. ئەوە وەهمە گەر مرۆڤ پێی وابێ خۆی لە کارێکی لەم جۆرەوە بگلێنێ و بەبێ چ مەترسییەک لێی دەرچێ. من بەردەوام ئەم شتەم زانیوە. دەبێ خۆم بۆ ئەوپەڕی مەترسی ئامادە بکەم.

خۆی لە ڕاستیدا ڕەوشەکە وا دەخوازێ کە خۆم داوای توێکاریکردنی لاشەکە بکەم، زۆر زەحمەتە کەسێکی تر ئەو داوایە بکات – ئا، بنیادەم ناشزانێ چۆن دەبێ... بە هاوکارەکەم دەڵێم کە لە خەیاڵی ئەوەدام داوای توێکاریکردنی لاشەکە بکەم، ئەو دەشێ وەڵام بداتەوە کە لە ڕووی بابەتییەوە شتێکی لەو جۆرە پێویست نییە، لەبەرئەوەی هۆی مردنەکە ڕۆشنە، بەڵام دەکرێ ئەوە بۆ ئەتەکێتی ئیداری شتێکی باش بێت... پاشان مەسەلەکە پشتگوێ دەخەم. هەرچۆنێک بێت ئەمە کەلەبەرێکی نەخشەکەمە. دەبێ کەمێک وردتر بیری لێ بکەمەوە.

بێ لەوەش مرۆڤ ناتوانێ پێشوەخت هەموو وردەکارییەکانی نەخشەکەی ڕێک بخات، ڕێکەوت شتێک لە پلانەکە هەر دەگۆڕێت، دەبێ مرۆڤ نەختێک حیساب بۆ هونەری ڕاگوزارییانەی خۆی بکات.

شتێکی تر – هەی نەفرەتم لێ بێت، سەیر چ دەبەنگێکم! هەڵبەت خۆ نابێ تەنیا بیر لەخۆم بکەمەوە. وای دانێ مەسەلەکە بە توێکاری گەیشت و منیش حەپی خۆم خوارد و بوومە هاوسەفەری قەشە گریگۆریۆس بۆ ئەو دنیا، ئەوکات چ ڕاڤەیەک بۆ ئەو تاوانکارییە سەرسوڕهێنە دەدۆزرێتەوە؟ خەڵک پەیجۆرن. کاتێ مردووەکان نهێنییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبەن، ئەدی ئەوسا نایەن داوای ڕاڤەکردن لە یەکێک لە زیندووەکان، داوای ڕاڤەکردن لە "ئەو" بکەن؟ بەرەو دادگا پەلکێشی دەکەن، لەگەڵیدا دەکۆڵنەوە، ڕاوەدووی دەنێن... بە زوویی بۆیان دەردەکەوێت کە ئەو خاوەن دۆست بووە... کە دەبێ ئاواتی بە مردنی قەشە خواستبێ و هێند پەرۆشی ئەو ساتەوەختە بووبێ کە مەسەلەکەی لا بووەتە شتێکی بەڵگەنەویست. ڕەنگە تەنانەت هەر تواناشی نەبێت حاشای لێ بکات. دونیام لەبەرچاو تاریک دەبێ... ئەوسا ئەوە من دەبم ئەی هەرە دڵگیرترین گوڵەژنە بچکۆلانەکە، کە دووچاری ئەمەم کردوویت.

کاتێ بیر لەمە دەکەمەوە دنیا لەبەر چاوانمدا تاریک و نووتەک دەبێت.

بەڵام ڕەنگە – لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە بیرۆکەیەکم هەبێت. ئەگەر بزانم کە دەبێ توێکارییەکە هەر بکرێت، ئەوسا لە کاتی گونجاودا و بەرلەوەی حەپەکەم بخۆم، چەند نیشانەیەکی شێتیەتی لە خۆمدا پیشان دەدەم. هێشتا باشترە – ئا، ئەم شتە باشەیان ئەوی تریان وەلانانێت – دۆکیومینتێک دەنووسم و بە کراوەیی لێرە لە ژوورەکە، کە بڕیارە لێی بمرم، لەسەر مێزەکەم دایدەنێم، پەڕەیەکی پڕ لە شتی تورەهات تێدا نووسراو، کە ڕاوەدوونانی شێتیەتی و ڕامانی ئاینی و شتی لەو بابەتە دەگەیەنێت: قەشە سالآنێکە بە دوامەوەیە، ڕۆحی ژەهراوی کردووم، هەربۆیە منیش جەستەیم ژەهراوی کرد، من وەک پارێزگاری لە خۆم بەو کارە هەستاوم و...هتد. دەکرێت چەند دێرێکی ناو ئینجیلیشی تێ هەڵکێش بکەم، هەمیشە چەند دێرێک هەن کە دەکرێ بگونجێن. بەو تەرزە مەسەلەکە ڕۆشن دەبێتەوە: بکوژەکە شێت بووە، ئیدی ئەو ڕاڤەیە بەسە و چ پێویست ناکات بەدوای کەسێکی تردا بگەڕێن، ڕێورەسمێکی ناشتنی مەسیحییانەم بۆ سازدەدەن و کریستینیش لەو شتە دڵنیادەبێ کە هەمیشە بە پەنهانی –ئا هەمیشە بە پەنهانی نا– گومانی لێ کردووم. سەدان جار ئەو پێی گوتووم کە من شێتم. ئەو دەتوانێ گەر پێویست بکا، شایەتییەکی باشم بۆ بدات.

## ١٤ی ئۆگۆستی

حەزم دەکرد هاوڕێیەکم هەبا کە متمانەم پێ کردبا. هاوڕێیەک کە بمتوانیبا ڕاوێژم پێ کردبا. بەڵام چ هاوڕێیەکی وام نییە، خۆ ئەگەر هەشمبا، ئەوا بەهەرحاڵ سنوور هەیە بۆ ئەو شتانەی کە مرۆڤ لە هاوڕێکانی داوایان دەکات.

هەڵبەت من هەمیشە کەمێک تەنیا بووم. من تەنیاییی خۆم لەناو حەشاماتی خەڵکدا هەڵگرتووە، وەک چۆن حەلەزۆنێک ماڵەکەی هەڵدەگرێت.

تەنیـایی بۆ هەندێک کەس دۆخـێک نییـە کـە بە ڕێکەوت کـەوتبنە ناوی، بگرە تەنیایـی بۆ ئەوانە خەسڵـەتێکە، تەنیاییـی من لەم مەسەلەیەدا گەورەتر دەبێت، مـەسـەلەکـە بەهەر لایـەکدا بکەوێت، بە باش یان بە خـراپ، سـزای من لەهەر دۆخێکدا کونجی تەنیاییە بە درێژاییی ژیان.

## ١٧ی ئۆگۆستی

گاڵتەجاڕ! زبڵ! هەرچی و پەرچی!

ئاه، بەچی دەچێ سـەرزەنشت – بنیـادەم ناتوانێ هیچ شـتـێکی لەگـەڵ ئەعسابی خۆیدا پێ بکات.

ماوەیەک لەمـەوبەر کـاتـی پێشـوازیکردن لە نەخۆش کۆتاییی هات، تازەکی دوایین نەخۆش ڕۆیشت، لەبەر پەنجەرەی هۆڵەکەدا ڕاوەستابووم و بیرم لەهیچ شـتـێک نەدەکـردەوە. لەناکـاوێکـڕا گـریگۆریۆسـم بینی بە گـۆڕسـتـانـەکـەدا ڕێگەکـەی گـۆڕی و ڕێک بەرەو لای دەرگـاکـەی من هـات. هەمـوو شـتـێک لەبەر چاوانمدا لیڵ و پێڵ بوو. ئاخـر چاوەڕێیم نەدەکـرد. نەمزانیـبوو گـەڕاوەتەوە. سـەرەسووڕە و سـەرەگێژەم پێ کەوت و دڵـم تێکەڵ هات، هەمـوو نیشـانەکانی دەریاسەرەگێژە(*). تەنێ خەیاڵێکم لەسەردا بوو: ئێستا نا، کاتێکی تر، ئێستا نا. لەسـەر پێپلیکانەکـانە، لەبەر دەرگـاکـەیە، ئەدی چ بکەم... چووم بۆ لای کـریستین و پێم گوت: گـەر هەر کـەسـێک هەواڵـی پرسـیم پێی بڵێ چوومـەتە دەرەوە... بە چاوانی زەق و دەم داپچڕینـەکەیدا تێ گەیشـتم کە دەبێ شـێوەم سـەیر نواندبێتی. بە پەلە خـۆم بە ژووری نووستنـەکەدا کرد و دەرگاکەیم قفڵ دا. لەکاتی خۆیدا خۆم گەیاندە سەر دەستشۆرییەکە: لە وێدا ڕشامەوە.

**

(*) sjösjuka دڵ تێکهـەڵاتنێک کە مـرۆڤ بەهۆی جووڵەی کـەشـتـییـەوە لە زەریادا دووچاری دەبێت. و، کوردی

کەواتە ترسەکەم لە جێی خۆیدا بوو؟ من بە کەڵک نایەم!

لەبەرئەوەی هەر ئێستا دەکرا ئەو شتە ڕووی دابا. ئەوەی دەیەوێت کارێک بکات، ئەوا دەبێت دەرفەت بقۆزێتەوە. کەس نازانێ ئاخۆ هەمدیس دەرفەتی ئاوها پەیدا دەبێتەوە؟ من بەکەڵک نایەم!

## ٢١ی ئۆگۆستی

ئەمڕۆ ئەوم بینی و قسەم لەگەڵدا کرد.

لای عەسر بۆ تاوێک بەرەو شێپەهۆلمن ڕۆیشتم. هەر کە گەیشتمە سەر پردەکە، "ڕێکێ"م بینی لەو تەپۆڵکەیەوە دەهاتە خوارەوە کە کڵێساکەی لێیە. خاوەخاو دەڕۆیشت و لە عەردەکەی دەنۆڕی، لچی هەڵقورتاو و بە گۆچانەکەی وردە بەردی لادەدا، بە ڕوخساریدا لەوە نەدەچوو لەگەڵ دنیاکەیدا زۆر قایلمەند بێت.. پێم وانەبوو دەمبینێت، بەڵام هەر کە بەلای یەکدیدا ڕەت بووین، سەری هەڵبڕی و لە دڵەوە و بە خۆشحاڵی سەری بۆ لەقاندم، بە خێراییی بروسکە، ڕوخساری گۆڕا. من لە ڕۆیشتنی خۆم بەردەوام بووم، بەڵام دوای یەک دوو هەنگاو ڕاوەستام. لە فیکرەوە چووم: بە دڵنیاییەوە ئەو ئێستا لەم ناوەوە دوور نییە. دەشێ ئێستا لەو سەرەوە لەسەر گردەکە ڕاوەستابێ. شتێکیان هەبووە و ویستوویانە بە یەکدیی بڵێن و ئیدی ژوانیان لەو سەرەوە کە بە دەگمەن خەڵکی بۆ دێت، داناوە، جا بۆ ئەوەی بە یەکەوە لەگەڵیدا نەبینرێت، ئەوا لێ گەڕاوە ئەم یەکەمجار بێتە خوارەوە. من لەسەر سەکۆیەک لەو سەکۆیانە دانیشتم کە دەوراندەوری قەدی دارچنارە گەورەکەیان داوە، دانیشتم و چاوەڕێم کرد. پێم وایە ئەمە گەورەترین درەختێکە لە ستۆکهۆڵم هەبێت. کاتێ منداڵ بووم زۆر شەوانی بەهار لەگەڵ دایکمدا لەژێر ئەم درەختەدا دادەنیشتم. قەت باوکمان لەگەڵدا نەدەبوو، باوکم حەزی لەوە نەبوو بێتە دەرەوە و لەگەڵ ئێمەدا بڕوات.

.... نەء، ئەو نەهات. پێم وابوو دەیبینم لە گردۆڵکەکەوە بێتە خوارێ، بەڵام

دەشێ لە ڕێگەیەکی ترەوە هاتبێتە خوارەوە یان ڕەنگە هەر لەوێش نەبووبێ.

بەهەرحاڵ بە لاڕێیەکدا بەلای کڵێساکەدا چوومە سەرێ - بینیم لەسەر پێپلیکانەیەکی دەرەوەی کڵێساکە دانیشتووە و خۆی دانەواندووە و دەستی لەژێر چەنەی ناوە. دانیشتووە و ڕێک لە خۆرەکە، کە لەوەدا بوو ئاوابێت، دەنۆڕێت. هەر لەبەر ئەوەبوو کە دەسبەجێ نەیبینیم.

هەر لە یەکەم جارەوە کە بینیم، زانیم چەندێک لەوانی تر جیاوازە. ئەو نە لە خاتوونێکی بەنێوبانگ دەچوو نە لە ژنێک لە چینی ناوەڕاست و نە لە ژنێکی عەوامیش. دەشێ زیاتر لەوەی دواییان چووبێت، بە تایبەتی کە ئەو ئێستا بە پرچە زەردە ڕووت و پەخشەکەیەوە لەبەر هەتاودا لەسەر پێپلیکانەی کڵێساکە دانیشتبوو، ئاخر ئەو کڵاوەکەی لەسەری داگرتبوو و لەلای خۆیەوە دایناببوو. بەڵام ژنێک لە خەڵکانێکی ڕەسەن یان ژنێک کە قەت نەبووە، ژنێک هی سەردەمانێک کە هێشتا خەڵک چینبەندی نەکراوە، هی سەردەمانێک کە خەڵک نەبوونەتە چینی خوارەوە. کیژێک لە نەسەبێکی ئازاد.

کوتوپڕ بینیم دانیشتووە و دەگری. گریان بە هەنسکەوە نا، بگرە تەنیا بە فرمێسکەوە. وەک کەسێک دەگریا، کە زۆر گریابێ و بە حاڵ هەست بکرێت کە دەگری.

دەمویست بگەڕێمەوە و دوور بکەومەوە، بەڵام لەو کاتەدا سەرنجم دا بینیومی. کەمێک وشک سڵاوم لێ کرد و ویستم لێی تێ پەڕم. بەڵام ئەو دەسبەجێ لەسەر پێپلیکانە نزمەکە هەستا، سووکەڵە و نەرم وەک ئەوەی لەسەر کورسییەک هەستێت، هاتە پێشەوە و دەستی بۆ ڕایەڵ کردم. بە پەلە فرمێسکەکانی وشک کردنەوە، کڵاوەکەی نایەوە سەر و ڕووپۆشێکی ڕەساسیی بە ڕوخساریدا دا.

بۆ ساتێک بێدەنگ ڕاوەستاین.

دواجار من گوتم: ئەم ئێوارەیە ئەم سەرەوە خۆشە.

ئەو گوتی: ئا، ئێوارەیەکی خۆشە. هاوینەکەشی خۆش بوو. وا ئیتر تەواو

دەبێت. لە ئێستاوە درەختەکان زەرد بوون. بنۆڕە، ئەوە پەڕەسێلکەیەک!

پەڕەسێلکەیەکی تەنیا بە خێرایی بەلاماندا فڕی، هێند نزیک کە من هەستم بە شنەیەکی سارد لەسەر پێڵووەکانم کرد، پێچ‌پێکی خێرای کردەوە و گۆشەیەکی تیژی تیرئاسای دروست کرد و ئیدی لە شینایی ئاسماندا بزربوو.

ئەو گوتی: "ئەمساڵ دنیا زوو گەرمی کرد. کەوایە پایز زوو دێت".

من پرسیم: "ئەدی قەشە وەزعی چۆنە؟"

وەڵامی دامەوە: "ئا سوپاست دەکەم. دوو ڕۆژێک لەمەوبەر لە پۆرلاوە گەڕاوەتەوە".

– هیچ باشتر بووە؟

سەری کەمێک وەرگێڕا و بە چاوانێکی نیوە هەڵهاتووەوە لە خۆرەکەی ڕوانی.

بە دەنگێکی نزم گوتی: "لە گۆشەنیگای منەوە نا".

حاڵی بووم. بەو جۆرەیە کە من بیرم لێ کردبووەوە. ئێ، خۆ مەزەندەکردنیش شتێکی زەحمەت نییە.

خاتوونێکی پیر بەوێدا تێ پەڕی کە گەڵای وشکی گسک دەدا. تا دەهات لێمان نزیک و نزیکتر دەبووەوە، ئێمە بە هێواشی دوور کەوتینەوە و چووینە سەر تەپۆڵکەکە. من دەڕۆیشتم و بیرم لە قەشە دەکردەوە. یەکەمجار بە تەندروستیی ژنەکەی ترساندم، ئەوە ئەوپەڕی دوو هەفتە بەکەڵک هات، ئینجا بە تەندروستیی خۆی و مردنی ڕەنگپەڕیو ترساندم، ئەوەش شەش هەفتە بڕی کرد. ئەمەش بۆیە وا ماوەیەکی درێژ کاریگەر بووە، چونکە لە ژنەکەی جیابووە. خەریکم باوەڕ بەوە دەهێنم کە مارکێل و سێرینا‌کانی ڕاستن: مرۆڤەکان نیگەرانی بەختەوەری نین، بگرە لە دووی لەزەتن. ئەوان لە دووی لەزەتن تەنانەت دژی حەز و ڕا و باوەڕیان. دژی بەختەوەرییان... ئەم ژنە

گەنجەش کە بە پشتێکی ئاوها ڕێک و بەخۆ شانازەوە، بەڵام بە گەردنێکەوە بەم هەمـوو پرچە ئاوریشـمـە زەردەوە، بە قـووڵـی لەژێر نیگەرانییـەکـانـیدا چەماوەتەوە و لەلامەوە دەڕوات – ئەویش هەمان شتی کردووە: لە دووی لەزەتە و چ نیگەرانـی بەختەوەری نییە. ئیدی ئێستا بۆ یەکەم جار بۆم دەرکەوت هەمـان شێوە ڕەفتارە کە بەرامبەر قەشەی پیر، پڕی کردووم لە نەفرەت و بەرامـبـەر ئەم ژنە گـەنجـەش لـە هەسـتێکی بێ کـۆتایی، ئا، پڕ لە ڕێزێکی شەرمنانە وەک ڕاوەستان لەنزیک خوایەتیدا.

خۆر ئێستا تۆختر لەمیانەی بازنـەی تەمتومانەکەی سەر ئاسمانی شارەوە هەڵایسابوو.

– خاتوو گریگۆریۆس، دەکرێ شتێکتان لێ بپرسم؟

– بەڵێ، بەخۆشحاڵییەوە.

– ئەو کەسەی خۆشـتـان دەوێ – هەڵبەت نازانم کێیە– چی لەم بارەیەوە و سەبارەت بەم هەموو شتانە دەڵێ و دەیەوێت چی بکات؟ چۆن دەیەوێ ئەمە بە لایەکدا بخات؟ چونکە ناکرێ بەمە قایلمەند بێت...؟

بۆ قـەیرێک بێدەنگ بوو. کەوتمە ئەوەی باوەڕبکەم بەوەی پرسـیـارەکـەم دەبەنگانە کردووە و ئەو حەز ناکات وەڵام بداتەوە.

دواجار گوتی: "ئەو دەیەوێت پێکەوە سەفەر بکەین".

ڕاچڵەکیم.

پرسیم: "باشە ئەو دەرەقەت دێت؟ مەبەستم ئەوەیە ئایا ئەو پیاوێکی ئازاد و کـامڵـە و بە ئیش و وەزیفـەوە نەبەسـتراوەتـەوە، پیاوێکە گەر شـتـێکی بوێت دەیکات؟"

– نا. دەبوایە دەمێک بوایە ئەوەمان بکردایە. ئەو هەمـوو داهاتووی لێرەیە. بەڵام دەیەوێت لە وڵاتێکی بێگانەدا، لە وڵاتێکی دوور، ڕەنگە لە ئەمـــەریکا ڕێگایەکی نوێ بۆ خۆی بکاتەوە.

دەبوو لە ناوەوەڕا پێ بکەنم. کلاس ڕێکێ و ئەمەریکا کوجا مەرحەبا! بەڵام کاتێک بیرم لەو کردەوە، وشک هەڵگەڕام. لە فیکرەوە چووم: لەو دوورە هەمان ئەو تایبەتمەندییانەی کە ئەوی لێرە هەڵکشاندووە، لەوێ بە ناخی ئەرزیدا دەبات. ئەدی ئەوسا ئەم چیی بەسەر دێت...

پرسیم: "ئەدی ئێوە خۆتان – ئێوەش ئەوەتان دەوێت؟"

سەری لەقاند. چاوانی پڕ لە فرمێسک بوون.

گوتی: "من حەزدەکەم بمرم".

خۆر وردە وردە لەو غوبارە خۆڵەمێشییەدا رۆدەچوو. کزەبایەکی سارد بەنێو درەختەکاندا دەیوژاند.

– من حەز ناکەم ژیانی ئەو وێران بکەم. نامەوێت ببمە بار بەسەر ئەوەوە. بۆچ دەبێ ئەو سەفەر بکات؟ دیارە لە پێناوی مندا. ئەو بەدرێژاییی ژیانی لێرە بووە. ئیشوکاری، داهاتووی، هاوڕێکانی، هەموو شتێکی.

نەمدەتوانی لەمبارەیەوە هیچی وەڵام بدەمەوە، ئاخر هەر زۆر زۆر لەسەر حەق بوو. بیرم لە ڕێکێ کردەوە. هەموو پێشنیارەکەیم زۆر پێ سەیر بوو. من هەرگیز شتێکی ئاوهام لێ چاوەڕوان نەدەکرد.

– خاتوو گریگۆریۆس، هەڵبەت من بە هاوڕێی خۆتان دەزانن و بەو شێوەیە تەماشام دەکەن، وایە؟ خۆ پێتان ناخۆش نییە لەبارەی ئەم شتانەوە لەگەڵتاندا دەدوێم؟

لەمیانەی فرمێسکەکانی و ڕووپۆشەکەیەوە زەردەخەنەی هاتێ – بەڵێ زەردەخەنەی هاتێ!

گوتی: "من زۆرم خۆش دەوێن. ئێوە شتێکتان بۆ من کردووە کە کەسی تر نەیتوانیوە یان نەیویستووە بۆم بکات. ئێوە دەتوانن لەبارەی هەر شتێکەوە پێتان خۆشە لەگەڵمدا بدوێن. زۆرم خۆش دەوێن کاتێ کە دەدوێن".

– ئایا ئەو، هاوڕێکەتان، دەمێکە دەیەوێت پێکەوە سەفەر بکەن. دەمێکە قسەتان لەوبارەیەوە کردووە؟

– بەر لەم ئێوارەیە هەرگیز. قەیرێک بەرلەوەی ئێوە بێن، ئێمە لەم سەرەوە یەکمان بینی. ئەو هەرگیز لەمەوبەر لەمبارەیەوە لەگەڵم نەدوابوو. پێم وانییە تەنانەت لەمەوبەر بیریشی لە شتێکی وا کردبێتەوە.

ئیتر تێ دەگەیشتم... پرسیم:

– ئایا شتێکی تایبەتی لە ئێستادا هەیە کە پاڵی پێوەنابێت ئەو بیرۆکەیەی بۆ بێت؟ شتێکی نیگەرانکەر...؟

ئەو سەری دانەواند.

– ڕەنگە.

پیرێژنەکە بە گسکەکەیەوە هەمدیس گەڵاکانی تەواوێک نزیک لە ئێمە گسک دەدا، ئێمە بە کاوەخۆ و بە بێدەنگی گەڕاینەوە بەرەو لای کلێساکە. لای ئەو پێپلیکانەیەوە ڕاوەستاین کە یەکەمجار یەکدیمان لێ بینی. ئەو ماندوو بوو: هەمدیس لەسەر پێپلیکانەکە دانیشت و دەستی نایەوە ژێر چەنەی و نیگای لە و خۆرنشینە خۆڵەمێشییە بڕی.

قەیرێکی درێژ بێدەنگ بووین. دەوروبەرمان ئارام، بەڵام بایەک بەسەر سەرمانەوە توندتر لە کەمێک لەوەوبەر بەنێو پۆپی درەختەکاندا دەیوژاند و ئیتر گەرما تینی شکابوو.

ئەو لە حەژمەت سەرما لەرزێکی پێدا هات.

گوتی: "حەز دەکەم بمرم، زۆر زۆر حەز دەکەم بمرم. من هەست دەکەم هەموو ئەو شتانەم بەدەست هێناون کە هی خۆمن، هەموو ئەو شتانەی کە دەبێ هەمبن. من هەرگیز ناتوانم ئاوها وەک ئەم هەفتانە بەختەوەر بم. بە دەگمەن ڕۆژێکیان تێ پەڕیون و من تیایدا نەگریاوم، بەڵام تیایاندا بەختەوەر بووم. لە هیچ پەژێوان نیم، بەڵام گەرەکمە بمرم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زەحمەتە. پێم وایە خۆکوشتن شتێکی ناشیرینە، بە تایبەتیش بۆ ژنێک. رقم لەهەر جۆرە توندوتیژییەکە لە سروشتدا. هەروا حەزیش ناکەم بە هیچ جۆرێک ئەو خەمین بکەم".

من بێدەنگ بووم و لێ گەڕام بدوێت. چاوی تا نیوە هەڵێنا.

– بەڵێ، خۆکوشتن شتێکی دزێوە. بەڵام دەکرێ هێشتا ژیان دزێوتر بێت. چ ترسناکە مرۆڤ بە زۆریی تەنیا لەنێو شتە کەم تا زۆر دزێوەکاندا هەڵبژێرێت. ئای گەر توانرابا مردن هەڵبژێردرابا.

من لە مردن ناترسم. تەنانەت گەر بشزانم دوای مردن شتێک هەیە و دەبێ لێی بترسم. من نەشتی باشم کردووە و نەشتی خراپ تا توانیبێتم جیاواز بم، لە مەسەلە گچکە و گەورەکاندا ئەو شتەم کردووە کە پێویستە بکرێت. بیرتانە جارێکیان لەبارەی عیشقی گەنجیمەوە بۆتان دوام کە ژێوان بووم لەوەی خۆمم تەسلیمی نەکرد؟ من چی دی ژێوان نیم. من ئیدی لە هیچ شتێک ژێوان نیم، تەنانەت لە شووکردنیشم. نەدەکرا هیچ شتێک لەمەی کە ئێستا ڕوودەدا، جیاوازتر با.

بەڵام باوەڕ ناکەم لەدوای مردنەوە شتێک هەبێت. کە منداڵ بووم پێم وابوو ڕۆح وەک مەلێکی چکۆڵانە وایە. لە کتێبێکی وێنەداری مێژوودا کە هی باوکم بوو، بینیم میسرییەکانیش ڕۆحیان وەک مەلێک وێنا کردووە. بەڵام مەلێک ناتوانێ بەرزتر بفڕێ لەوەی کە هەوا بەش دەکات، هەواش بەشی فڕینی بەرز ناکات. مەلیش بە عەردەوە پێوەستە. لە قوتابخانە مامۆستایەکمان هەبوو وانەی زانستی سروشتیی پێ دەگوتین، بۆی لێک دەدایەوە هیچ شتێک لەسەر ئەرز نییە، کە بتوانێ لێی دوور بکەوێتەوە.

من هەڵم دایێ و گوتم:

– دەترسم ئەو مامۆستایە سەهوو بێ.

– ڕێی تێ دەچێ. بەڵام بەهەرحاڵ من باوەڕم بەو مەلە هێنا و ڕۆح تا دەهات زیاتر لەلام نا ڕۆشنتر دەبوو. چەند ساڵێک لەمەوبەر هەر شتێکم بهاتبایە بەر دەست لەبارەی ئاین و شتی لەو بابەتەوە، لەگەڵ و لە دژی دەمخوێندەوە. هەڵبەت ئەوە یارمەتیی دام لە تێگەیشتنەکانمدا، بەڵام نەیگەیاندمە ئەو شتەی خۆم دەمویست. خەڵکانێک هەن زۆر نایاب دەنووسن و

پێم وایە هەرشتێکیان بوێت دەیسەلمێنن. من هەمیشە بڕوام وابووە ئەو کەسانە لەسەر حەقن کە باشتر و جوانتر دەنووسن. ستایشی "ڤیکتۆر ڕیدبێری"یم دەکرد، بەڵام هەستم دەکرد و حاڵی دەبووم لەوەی کەس لەبارەی ژیان و مردنەوە هیچ نازانێت.

بەڵام –لەم کاتەدا ڕەنگێکی تۆخ و گەرم لە تاریکیدا لەسەر گۆناکانی نیشت– بەڵام بەو دواییانە شتی زیاترم لەبارەی خۆمەوە زانی وەک لەوەی پێشتر بە درێژاییی ژیانم دەمزانین. کەوتمە ئەوەی فێربم جەستەی خۆم بناسم، فێربم هەست بکەم و تێ بگەم کە جەستەم خۆمە. لەودا نەبێ چ شادمانی و چ غەم و چ ژیانێک بوونی نییە. هەڵبەت جەستەشم دەزانێت کە دەبێت بمرێت. هەست بەوە دەکات وەک چۆن ئاژەڵێک هەستی پێ دەکات. لەبەرئەوە ئێستا دەزانم کە لەودیو مردنەوە هیچ شتێکم نییە.

دنیا تاریکی کردبوو. هەنووکە لە تاریکیدا ژاوەژاوی شار تا دەهات بەهێزتر دەگەیشتە گوێمان، گڵۆپەکان لە خوارەوە لە لێوارەکاندا بەدرێژاییی لەنگەرگە و پردەکاندا دەگیرسێنران.

گوتم: "بەڵێ، جەستەتان دەزانێ کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەمرێت. بەڵام نایەوێت بمرێت، دەیەوێت بژی. نایەوێت بمرێت بەرلەوەی نەسووێت و بە ساڵەکان قورس نەبێت. دانەخورێت بە ئازار و نەسووتێت بە ئارەزوو. ئەوسا گەرەکییەتی بمرێت. ئێوە پێتان وایە دەتانەوێت بمرن، لەبەرئەوەی ئێستا هەموو شتەکان زۆر ڕەش خۆ دەنوێنن. بەڵام ئێوە ئەوەتان ناوێ، من دەزانم ئێوە ناتوانن ئەوە هەڵبژێرن. لێ گەڕێ کات تێ پەڕێت. خۆت بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە بکە کە دێت. ئەوسا دەکرێ هەموو شتێک جیاواز لەوە دەربکەوێت کە بیری لێ دەکەنەوە، هەروەها دەکرێ خۆشتان جیاواز بن. ئێوە بەهێز و تەندروستن، دەکرێ بەهێزتریش بن، ئێوە لەو کەسانەن دەکرێ گەشە بکەن و نوێ ببنەوە".

سەرمایەک بە جەستەیدا تێ پەڕی. هەستا.

– درەنگە. دەبێ بۆ ماڵەوە بچمەوە. ئێمە ناتوانین بە جووتە لێرە بچینە

خوارەوە، باش نییە گەر یەکێک بمانبینێت. تۆ لەو ڕێگەیەوە برۆ، من بەم لایەی تردا دەڕۆم. شەوشاد.

دەستی بۆ ڕایەڵ کردم. گوتم:

– پێم خۆشە گۆناتان ماچ بکەم. دەتوانم؟

ڕووپۆشەکەی هەڵبڕی و گۆنای هێنایە پێش. ماچم کرد.

گوتی:

– حەز دەکەم نێوچەوانتان ماچ بکەم. نێوچەوانتان جوانە.

کاتێ کڵاوەکەم داگرت، با گڵۆڵە مووی تەنکی سەرمی دەهێنا و دەبرد. سەرمی لە نێوان دەستە گەرمە نەرمەکانیدا گرت و شکۆدارانە وەک ڕێوڕەسمێک، نێوچەوانی ماچ کردم.

## ٢٢ی ئۆگۆستی

چ بەیانییەکە! هەستکردنێکی تەنک و ئارام بە پایز لەو هەوا وەک شووشە ڕۆشنەدا.

لە میانەی ئەسپسواریی بەیانیاندا خاتوو "مێرتێن"م بینی و کە بەلای یەکدیدا تێ پەڕین، چەند قسەیەکی خۆشم لەگەڵیدا گۆڕییەوە. حەزم لە چاوانیەتی. پێم وایە چاوانی لەوە قووڵترن کە مرۆڤ لەیەکەم ساتدا دەیانبینێ. هەروەها پرچیشی. بەڵام لەوە بترازێ شتی زیاتری تێدا نییە کە بکرێ بخرێتە لیستی شایستەییەکانییەوە. با، هەروەها بێ چەندوچوون خاوەن خەسڵەتێکی کەمێک میهرەبانیشە.

بە دەوری یورگۆردندا ئەسپ سواریم کرد و بە درێژاییی کات بیرم لەو دەکردەوە کە لەو سەرەوە لای کڵێساکەوە لەسەر پێپلیکانەکە دانیشتبوو، لە خۆری دەنۆڕی و دەگریا و پەرۆشی ئەوە بوو کە بمرێت. لە ڕاستیدا: گەر یارمەتییەکی نەگاتێ، گەر شتێک ڕوونەدا– گەر ئەوە ڕوونەدا کە من بیرم لێ

کردووەتەوە- ئەوسا هەموو هەوڵێک بۆ دڵنەواییکردنی بە وشە، تەنیا قسەی قۆڕە، من خۆم هەستم بەوە کرد کاتێ قسانم لەگەڵدا کرد. ئەوسا ئەو لەسەر حەقە، هەزار جار لەسەر حەقە گەر مردن بە ئاوات بخوازێت. ئەو نە سەفەر دەکا و نە دەشمێنێتەوە. ئەدی لەگەڵ کلاس ڕێکێدا سەفەر بکات؟ ڕێکێ ببێتە بارێک بە کۆڵییەوە و پێوەندێک بە پێیەوە؟ من دۆعای بۆ دەکەم کە نەچێتە ژێر باری ئەوەوە. ئاخر هەردووکیان تیا دەچن. دەڵێن ئەو لێرە کەسێکی بۆ گوزەراوە، پێیەکی لە وەزارەتخانەکەیەتی و پێیەکیشی لە دنیای بازاڕ ، گوێم لێ بووە خەڵکی بە "پیاوێکی داهاتوودار" بانگی دەکەن، گەر لێرە قەرزداریش بێت، دەی ئەمیش وەک پیاوانی داهاتووداری تر کە بەرلەوەی شوێن و مەقامیان جێگیر بێت، قەرزارن. ئەو ڕێک خاوەن ئەو بەهرە گونجاوەیە کە یارمەتی ئینسان دەدا تا لەو ژینگە شیاوەدا بەرەوپێش بچێت، هەڵبەت ئەو خوان چ توخمێکی هێز نییە، "ڕێگایەکی نوێ بکاتەوە"... نەء، ئەو لەو جۆرانە نییە. خاتوون گریگۆریۆسیش ناتوانێ لەو ژیانەی پێشوویدا بمێنێتەوە. ئەو دیلێکە لە وڵاتی دوژمندا. منداڵەکەی لەژێر سایەی ئەو پیاوە غەریبەیەدا ببێ و ناچار بێت دووڕووی و درۆی بۆ بکات و شادمانییە باوکانە قێزەونەکەی ببینێت – کە دەشێ ئەو شادمانییەی قەشە بەهۆی بەدگومانییەکانییەوە کە ناوێرێت پێی لێ بنێ، کەمڕەنگ بووبێ. بەڵام بەکاری دەبات تا هەرچی زیاتر ژیانی ژنەکەی ژەهراوی بکات... نەء، ئەو ژنە قەت ناتوانێت، گەر هەوڵ بدات بتوانێت، ئەوا مەسەلەکە بە جۆرێک لە کارەسات کۆتاییی دێت... ئەو دەبێت ئازاد بێت. ئەو دەبێ خاوەنی خۆی بێ و توانای بەسەر خۆی و منداڵەکەیدا هەبێت. ئەوسا هەموو شتێک بۆ ئەو ڕێک دەبێتەوە، ئەوسا ژیان بۆ ئەو دەلوێ و لەزەتی لێ دەبا. من سوێندێکم خواردووە بە ڕۆحم: ئەو دەبێ ئازاد بێ.

من هەر ئێستا لە وادەی بینینی نەخۆشەکانمدا دڵەڕاوکێیەکی بڕست لێبڕ دای گرتم. پێم وابوو قەشە ئەمڕۆ دێت، هەستم کرد ئەوە بە دڵمدا دەزانم... ئەو نەهات، قەیدی ناکات، هەر کاتێ بێت نابێت ئامادە نەبم. نابێ ئەوەی پێنج شەممە ڕووی دا، دووبارە بێتەوە.

ئێستا دەچمە دەرەوە و شێو دەکەم. حەزم دەکرد مارکێلم بینیبا، ئەوسا دەمتوانی لە هاسێل باکێن داوەتی شێوم کردبا. دەمەوێت قسان بکەم و شەراب بخۆمەوە و لە خەڵک بنۆڕم.

کریستین شێوی ئامادەکردووە و ئیدی کەللەیی دەبێت، بەڵام دەی قەیدی ناکات.

(دواتر...)

ئیتر تەواو، تەواو بوو. کردم.

چ سەیر هات. چەند سەیر ڕێکەوت ئەوەی بۆ ڕێکخستم. خەریک بوو وەسوەسە ببم کە باوەڕ بە میهری خوا بهێنم.

هەست دەکەم بەتاڵ و سووکەڵەم وەک هێلکەیەکی هەڵلوشراو. ئێستا کاتێ لە دەرگای هۆڵەکەوە هاتم و خۆمم لە ئاوێنەکەدا بینی، لە بەردەم گوزارشتی ڕوخسارمدا ڕاچڵەکیم، شتێک بەتاڵ و وشک بووەتەوە، شتێک کە نازانم چییە، شتێک ئەو کاتژمێرە بێ میلەم وەبیردێنێتەوە کە لە گیرفانمدا هەڵم گرتووە. دەبێ لە خۆم بپرسم: ئەوەی ئەمڕۆ کردت، هەر هەموو ناوەڕۆکی خۆت بوو، چما ئاخۆ هیچ شتێکی تر لە ناوەوەڕا ماوە؟

قسەی قۆڕ. ئەمە هەستێکە و تێ دەپەڕێت. کەمێک سەرم دێشێت. پێوەی ڕاهاتووم.

سەعات حەوت و نیوە، تاوێک لەمەوبەر خۆرئاوا بوو. سەعات چوار و چارەک بوو کە هاتمە دەرەوە. واتە سێ سەعات... سێ سەعات و چەند دەقیقەیەک.

.... ئەدی هاتمە دەرەوە تا شێو بکەم، پێچپێکم بە گۆڕستانەکەدا لێ دا، لە دەروازەکەوە ڕۆیشتم، بۆ ساتێک لەبەر جامی دوکانی کاتژمێرفرۆشەکەدا ڕاوەستام. کابرای پشتکۆم لە دوکانەکەوە بە زەردەخەنەوە سڵاوێکی لێ کردم و منیش سڵاوەکەیم سەندەوە. بیرمە ئەم کاردانەوەیەم لەلا دروست بوو: هەر جارێک پشتکۆمێک ببینم، لە هاوسۆزیمەوە هەست دەکەم کە خۆم کەمێک

پشـتم کۆمـە. دەشێ ئەمـە کاریگەریی ئەو کاردانەوەیە بێت کە هـەر لە تافی منداڵییـەوە فێری هاوسـۆزیکردنمان لەگەڵ بەدبەختییدا دەکەن... گـەیشـتمـە سەر شـەقـامی درۆتنین، چوومە دوکانی هاڤانا و دوو چرووتی مـارکەی ئاپمانم کـڕی. بە سـووچـی جـاددەی فـرێددا داگـەڕام. کـاتێ گـەیشـتـمـە گـۆڕەپانی گوستاڤ ئالدۆلف چاوێکم بە پەنجەرەکانی ڕیدبێریدا گێڕا بەو هیوایەی بەڵکو مـارکـێل لەوێ بەدیار بـادە ئەبسـەنتـەکـەیـەوە دانیشـتـبێ، کـە وا راهـاتووە ناو بەناو دەیخـواتەوە، بەڵام تـەنیـا بیـرک بە پەرداخـێک لیـمـۆوە لەوێ دانیـشـتـبـوو. ئەو کـابرایەکی بێ خـوڵقـە، هیچ ئارەزوویەکم نـەبوو دووقـۆڵی لـەگـەڵیـدا شـێـو بکەم... لە دەرەوەی دوکـانی ڕۆژنامـەفرۆشـێک، ڕۆژنامـەیەکی ئافـتـون بلادێتم کـڕی و نـامـە گـیـرفـانم. بیـرم کـردەوە ڕەنگە شـتـێکی تازەی سـەبارەت بە هەڵلاکـەی دریێـڤـیـوس تێـدابێ... بەڵام من بـە درێژاییی کـاتەکە دەڕۆیشـتـم و دەمگوت ئاخـۆ چۆن بتـوانم مـارکـێل پەیدا بکەم. تەلەفۆنکردن بۆ ڕۆژنامـەکـەی کەڵکی نەبوو، ئاخر ئەو هەرگیز لەم کاتانەدا لەوێ نییە ، لە کاتێکدا کە بیـرم لەمـە دەکردەوە چوومـە دوکـانی سیگـارفـرۆشـێکەوە و تەلەفـۆنم کـرد. تازەکی دەرچووبوو... لە گـۆڕەپانی یاکـوب لە دوورەوەڕا بینیم وا قـەشـە گـریگۆریۆس بەرەو ڕووم دێت. خـۆم ئامـادەکردبوو تا سـڵاوی لێ بکەم، کەچی لەناکاوێکڕا بۆم دەرکـەوت کـە ئەوە هەو نیـیـە، تـەنانەت هـیچ شـتـێکی لەو نەدەچـوو. لە فیکرەوە چووم:

– کەواتە زوو بە زوو دەیبینم.

چونکە بە گوێرەی باوەڕێکی باو و بڵاوی ناو خەڵک، کە ئەزموونی خۆیشم لە نـاوەوەمـڕا لە ڕێکەوتێکدا پێی سـەلماندبـووم، بەوەی بە هـەڵە ناسـینەوەی کەسێکی لەو بابـەتە، جۆرە ئاگادارکردنەوەیەکە. بیـریشـم کەوتەوە تەنانەت لە ڕۆژنامـەیەکی زانسـتـیی تایبـەت بە "توێژینـەوەی دەروونناسـی"دا چیـرۆکـێکم لەبارەی پیـاوێک خـوێندبووەوە کـە لەدوای "ئاگـادارکـردنەوە" یەکی ئاوها لە جادەیەکدا، لاڕێیـەکی تر دەگرێ تا خـۆی لە بینینی کەسـێک لابدا، کە لەبەر دڵی گران بوو بیبینێت – کەچی رێک کەوتبـووە نێو باوەشی ئەو کەسەوە کە

خۆی لە بینینی لادابوو... بەڵام من باوەڕم بەم شتە تووڕەهاتانە نییە، بیر و هۆشم بەردەوام لە دووی ئەوە بوو چۆن مارکێل بدۆزمەوە. بە بیرمدا هات کە یەک دوو جار لەم کاتانەدا مارکێلم لای دوکانی ئاو فرۆشییەکەی گۆڕەپانەکەدا بینیوە، چووم بۆ ئەوێ، هەڵبەت لەوێ نەبوو، بەڵام بەهەرحاڵ لەوێ لەسەر یەکێک لە سەکۆکانی ژێر درەختە گەورەکەی پاڵ شووورای گۆڕستانەکە دانیشتم تا لەگەڵ چاوخشان بە ئافتون بلادێتەکەمدا پەرداخێک ئاوی ڤیچی بخۆمەوە. هێشتا بەحاڵ ڕۆژنامەکەم کردبووەوە و چاوم چووبووە سەر مانشێتێکی زەق: هەڵلاکەی درێفیوس(*) – دەنگی هەنگاونانێکی قورسم لەسەر چەوەکە ژنەوت کە زیخ لە ژێر پێیدا دەردەچوو، ئیدی قەشە گریگۆریۆس لەبەردەممدا ڕاوەستابوو.

– ئەوە تۆیت دوکتۆر، ڕۆژباش، ڕۆژباش. یارمەتی هەیە دانیشم؟ لە خەیاڵی ئەوەدا بووم کە بەر لە شێو پەرداخێک ئاوی ڤیچی بخۆمەوە. ئاخۆ هەڵبەت ئەوە بۆ دڵ خراپ نییە؟

وەڵامیم دایەوە: "ئا، دیۆکسیدی کاربۆن هەڵبەت باش نییە، بەڵام ناو بەناو پەرداخێکی کەم چ زیانێکی نییە. دوای سەفەری کەنار زەریا وەزعتان چۆنە؟"

---

(*) Dreyfusaffären: درێفیوس ١٨٥٩–١٩٣٥، ئەفسەرێکی جوولەکەی ناو سوپای فەرەنسا بوو کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا و بەهۆی پیلانێکەوە تێوە گلا، تاوانی خیانەتکردن لە وڵاتی بەسەردا ساغ کرایەوە و بەرەو دورگەی شەیتان دوورخرایەوە. پاشان دەرکەوت حوکمەکەی لەسەر بەڵگەنامەگەلی هەڵبەستراو بووە و تاوانبارە ڕاستەقینەکە مێجەر فێردیناند والسین ئێستێرهایزە. دوای نامەیەکی کراوەی ئەمیل زۆلا بەناوی (من شکایەتم هەیە) بۆ سەرۆک کۆماری فەرەنسا، سەرلەنوێ دادگاییی درێفیۆس کرایەوە و لە ساڵی ١٩٠٦دا حوکمەکەی پووچەڵ کرایەوە. ئەم مەسەلەیەی درێفیوس لەکاتی خۆیدا بووە پرسێکی سیاسیی گەورە و خەریک بوو فەرەنسای دەکردە دوو بەرەوە. زۆر لە نووسەر و هونەرمەندانی ئەو سەردەمە لەسەر درێفیوسیان کردەوە و ناڕەزاییان دژی حوکمی دادگاییکردنەکەی دەربڕی. و. کوردی

– زۆر باشه. پێم وایه ئەوه شتێک بوو زۆر پێویستم پێی بوو. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر سەردانی دوکتۆرم کرد، وا بزانم پێنج شەممە بوو، بەڵام درەنگ هاتم. دوکتۆر ڕۆیشتبوو.

وەڵامیم دایەوە کە من وا راهاتووم سەعات یان نیو سەعات دوای کۆتایی هاتنی وادەی بینینی نەخۆشەکانم لەوێ دەمێنمەوە، بەڵام بەداخەوە ئەو ڕۆژە ناچار بووم کەمێک زووتر لە کاتی ئاسایدا بچمە دەرەوە. داوام لێ کرد سبەینێ بێت. ئەو نەیدەزانی کە ئاخۆ سبەینێ کاتی هەیە، بەڵام هەوڵ دەدا . گوتی:

– پورلا جێگایەکی جوانە.

(پورلا ناخۆشە. بەڵام گریگۆریۆس وەک شارنشینێک هەمیشە لادێی بەلاوە خۆشە، ئیدی ئەو جێگایە چەندێک جوان یان ناشیرین بێت. جگە لەوە ئەو پارەی داوە و گەرەکی بوو بەرامبەر پارەکەی، تا ئەو پەڕی شتی دەست کەوێت، لەبەر ئەوە ئەوێی پێ جوان بووە).

وەڵامیم دایەوە: "ئا، پورلا تا ڕادەیەک خۆشە. بەڵام لەچاو شوێنی تردا ئەو خۆشە نییە".

پێی لێ نا: "ڕۆنێبی ڕەنگە خۆشتر بێت، بەڵام زۆر دوور و گرانە".

کچێکی منداڵکار ئاوەکانمانی هێنا، دوو بوتڵی چارەکی.

لەناکاوێکرا بیرۆکەیەکم بۆ هات. لەبەرئەوەی ئەو شتە هەر دەبێ ڕوو بدات، ئەدی بۆ لێرەدا ڕوونەدا؟ بۆ ئێستا ڕوو نەدا؟ تەماشایەکی دەوروبەری خۆم کرد. ئێستا هیچ کەسێکمان لە نزیکەوە نەبوو. لە دوورەوە لەسەر مێزێک سێ زەلامی پیر دانیشتبوون، یەکێکیانم دەناسی کە کاپتنێکی جەنگاوەرانی هێزی سوارە بوو، بەڵام بە دەنگی بەرز لەگەڵ یەکدیدا دەدوان و بەسەرهاتیان دەگێڕایەوە و پێ دەکەنین و نەیاندەتوانی گوێیان لێمان بێ ئێمە چ دەڵێین یان بمانبینن چ دەکەین. کچێکی گچکەی پیسوپۆخڵی پێپەتی هاتە پێشەوە بۆ لامان و گوڵی بۆ ڕاگرتین، ئێمە سەرمان ڕاوەشاند و ئەویش هەروا بە

بێـدەنگی دیارنـەما. لەم کـاتە درەنـگەی عـەسـردا مـەیدانە چەوڕێژکراوەکـەی بەردەممان تا ڕادەیەک چۆڵ بوو. لـە سووچی کڵـێساکەوە جـاروبار ڕێبـوارێک ڕێگەی دەگـۆڕی و بەرەو کـۆڵانە درەختـدارەکە بەرەوخـوار دەبووەوە. گـەرمـای خـۆری هـاوینێکی درەنگ ڕووکـاری خـانووبـەرە کـۆن و زەردەکـەی شـانۆی درامـاتنی لـە نێـوان دارزەیزەفـوونەکـانـدا بە ڕەنگێکی ئاڵتـوونی دەرهێـنابوو. لەســەر پیــادەڕۆکــە بەڕێوەبەری شــانۆکــە ڕاوەســتــا و قــســانی لەگــەڵ دەرهێنەرەکەدا دەکرد. مـەوداکە کردبوونییە مینیـاتور، جـووڵەی جـەسـتـەیان تەنیـا بۆ چـاوانێک کە لەوەوبەر ناسـیـبـنی، مـایەی تێگەیشـتن و لێکدانەوە بوو. دەرهێنەرەکە بە ئـارەقـچنە سوورەکەی سەرییەوە کە لەبەر هەتاوەکەدا بووبووە پزیسکێکی گچکە، دەناسـرایەوە، بەڕێوەبەری شـانۆکە بە جـووڵە ناسکەکـانی دەسـتیدا کـە پێ دەچوو بڵـێ: "ئـا، خـوایە، هەمـوو شـتێک دوو دیوی هـەیە!" من دڵنیابووم کە ئەو شتێکی لەم بابەتە دەگوت، شانبادانە سووکەڵەکانیم دەبینی، پێم وابوو گوێشـم لە تۆنی دەنگی بوو. قسـەکـانیم بۆ خـۆم گونجاند. بەڵێ، هـەر شـتێک دوو دیوی هـەیە. بەڵام بنیـادەم کە چاوانی بۆ هـەردووکیـان دەکاتەوە، دواجـار دەبێ یەکێکیان هـەڵبژێرێت. دەی منیش دەمێک بوو هـەڵبژاردنی خـۆم کردبوو.

کیفی کاتژمێرەکەم لە گیرفانی هێلەکەکەم دەرهێنا، حەپێکم لەنێوان پەنجە کەڵە و پەنجەی دۆشـاومژەدا گـرت، نەختـێک رووم کرد بەولاوە و وا خـۆم نواند دەیخـۆم. ئەوسـا قـومـێکم لە پەرداخی ئـاوەکـەم دا، وەک بڵـێی حـەپەکـەی پێ قووت بدەم. قەشە دەسبەجێ سەرنجی کێش بوو. گوتی:

– پێم وایە دوکتۆر دەرمان بەکاردەهێنێ؟

وەڵامیم دایەوە: "بەڵێ، کـەمێک دڵمان باش نـییە. دڵی منیش وەک ئەوە نییە کە پێـویسـتە وا بێت. بەهۆی ئەوەوەیە کە زۆر جگەرە دەکێشـم. گـەر توانیـبـام جگەرە نەکـێشـم ئەوا هـەرگـیـز پێـویسـتم بەم شـتـە تووڕەهاتە نەدەبوو. ئەمـە دەرمانێکی تا ڕادەیەک نوێیە، لە کۆوارێکی پزیشکیی ئەڵمانییدا بینیم کە زۆر راسپێیریی لەسـەر کرابوو، بەڵام من حـەز دەکەم یەکەم جار لەسـەر خـۆم تاقیی

بکەمەوە بەرلەوەی بۆ نەخۆشەکانمی بنووسم. ئێستا ئەوە زیاد لە مانگێکە بەکاری دەهێنم و پێم نایابە. بنیادەم ساتێک بەر لە شێو حەپێکی لێ دەخوات، ئیدی بەر بە "تای خواردن" و دردۆنگی و دڵەکوتێی دوای ژەمی خواردن دەگرێ. دەفەرموون؟"

قوتووەکەم بۆ ڕایەڵ کرد، سەرقاپەکەی کرابووەوە و بە شێوەیەک هەڵدرابووەوە کە ئەو نەیدەتوانی بیبینێ ئەوە کیفی کاتژمێرە، ئاخر دەکرا ئەوەی بۆ ببوایەتە بابەتێک بۆ پرسیار و قسەی ناپێویست.

گوتی: "سوپاست دەکەم."

زیاتر گوتم: "دەتوانم سبەینێ ڕەچەتەیەکتان لێی بۆ بنووسم."

حەپێکی هەڵگرت و بەبێ چ پرسیاری زیاتر لەگەڵ قومێک ئاودا قووتی دا. هەستم کرد دڵم لە لێدان کەوت. زەق زەق لە بەردەمی خۆم ڕووانی. گۆڕەپانەکە چۆڵ و وەک بیابان وشک. ئەفسەرێکی بەشکۆی پۆلیس بەکاوەخۆ لەوێوە تێ پەڕی، ڕاوەستا، بە پەنجەکانی کەمێک تۆزی لەسەر پاڵتۆ زۆر پاکوخاوێنەکەی تەکاند و هەمدیس لەسەر گەڕانەکەی خۆی بەردەوام بوو. تیشکی خۆر هێشتا هەمان گەرم و زەرد دەیدا لە دیوارەکەی شانۆی دراماتن. هەنووکە بەڕێوەبەری شانۆ کە قلافەتێکی نواند کە بەدەگمەن دەیکرد، قلافەتێکی جوولەکانە بە دوو دەستی بۆ دەرەوە ڕاگیراو، قلافەتی بازرگانێک کە مانای ئەمە بوو: "من ناوەوەی خۆم دەخەمە ڕوو، من هیچ ناشارمەوە، من دەستم لە ڕووە." ئارەقچنی سوور لەسەریش دوو جار سەری بۆ لەقاند.

قەشە گوتی: "ئەم دوکانی ئاو فرۆشییە کۆنە، هەڵبەت کۆنترین جۆری دوکانی ئاوفرۆشییە لە ستۆکهۆڵم".

بێ ئەوەی لا بکەمەوە، وەڵامیم دایەوە: "بەڵێ، دوکانێکی کۆنە".

کاتژمێرەکەی کڵێسای یاکوب سەعات چارەک بۆ پێنجی ڕاگەیاند.

بە شێوەیەکی خۆکرد دەستم برد و کاتژمێرەکەم دەرهێنا تا بزانم کۆکە، بەڵام دەستم کوێرانە دەگەڕا و دەلەرزی بە شێوەیەک کە کاتژمێرەکەم لە

دەست کەوتە خوارەوە بۆ سەر ئەرزەکە و شووشەکەی شکا. کە دانەویمەوە تا هەڵی بگرمەوە، بینیم حەپێک لەسەر ئەرزەکە کەوتووە، ئەوە ئەو حەپە بوو کە تازەکی وا خۆم نواند قووتی دەدەم. لەژێر پێمدا پلیشاندمەوە. هەر لەوکاتەدا گوێم لێ بوو پەرداخی ئاوەکەی قەشە بەسەر سینییەکەدا کەوت. حەزم نەدەکرد تەماشای ئەوێوە بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بینیم باسکی شۆڕبووەتەوە و سەریشی بەسەر سینگیدا کەوتووە و چاوە کوژاوەکانیشی زەق...

**

قسەی هیچ ، لەوەتەی هاتوومەتەوە ماڵەوە، ئەوە سێیەم جارە هەڵدەستم و دەست دەبەم بزانم ئاخۆ دەرگەکەم داخراوە. لە چی دەترسم؟ لە هیچ. لە هیچ شتێک. کارەکەم رێکوپێک و ناسک جێبەجێ کرد، ئیدی هەر کەسێک شتێکی هەیە با بیڵێت. هەروەها رێکەوتیش یارمەتیی دام. بەختم هەبوو حەپەکەم لەسەر ئەرزەکە بینی و پانوپلیشم کردەوە. گەر کاتژمێرەکەم نەکەوتایە، ئەوا رەنگە حەپەکەم لەسەر ئەرزەکە نەبینیبا. کەواتە بەختم هەبوو کاتژمێرەکەم لە دەست بەربووەوە...

قەشە بە سەکتەی دڵ مرد، من خۆم گەواهینامەی مردنەکەیم نووسی. قەشە لەم گەرما بەتینەی هاویندا، گەرمالێداو و بە هەناسەبڕکێوە هات، زۆر بە خێرایی و بێ ئەوەی لێ گەڕێ گازەکەی بنیشێت یەک پەرداخی گەورە ئاوی ڤیچی هەڵقوڕاند. من ئەم قسانەم بۆ ئەفسەرە پۆلیسە بەشکۆکە کرد کە لای کردەوە و گەڕایەوە، ئەم قسانەم بۆ کیژە گچکە خزمەتکارە زەندەقچووەکە و بۆ چەند کەسێکی پەیجور کرد کە لەوێدا کۆبوونەوە. ئامۆژگاری قەشەم کرد لێ گەڕێ گازی ئاوەکە بەرلەوەی بیخواتەوە، بۆ ساتێک بنیشێت ، بەڵام ئەو تینووی بوو، نەیدەویست بە قسەم بکات. ئەفسەرەکە گوتی: "بەڵێ، من تازەکی کە بێرەدا تێ پەڕیم، بە چاوی خۆم بینیم کە چۆن ئەم پیرەمێردە بەڕێزە، شپرزە و تینوو ئاوەکەی بەسەرییەوە نا. لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەمەی بۆ باش نییە"... لەنێو ئەو رێبوارانەدا کە لەوێدا راوەستان، قەشەیەکی گەنجیان تێدا

بوو مـردووەکـەی دەناسی. ئـەو ئەوەی لە ئەسـتـۆی خـۆی گـرت کـە هـەواڵەکـە چەندێک بکرێ نەرم و هاسانگیر بە خاتوو گریگۆریۆس ڕابگەیەنێت.

هیچ شـتێک نیـیـە لێی بـترسم. بۆچی ئاوها بەردەوام دەست لە دەرگـەکەم دەدەم؟ لەبەرئەوەی هەستێکم هەیە بەوەی گوشارێکی بێ وێنەی ئەتمۆسفاری لە ڕوانگەی خـەڵکانی تر، لە زیندووان، لە مردووان و لەوانەی هـێشتا لەدایک نەبوون، لە دەرەوە گـرد بـوونەتـەوە و هـەڕەشــە دەکــەن دەرگــەکــە بشکێنن و وردوخـاشـم بکەن و بمهـاڕن... دەی لەبەرئەوەیە ئاوها دەست لە کێلوونەکە دەدەم.

....کاتێ دواجار توانیم لەوێ دەرچم، لە ترامێکدا دانیشتم، یەکەم ترامێک کە دەستم پێیدا ڕاگەیشت. ترامەکە بردمی بۆ دوور بۆ کیونگسهۆلم. درێژەم بە ڕۆیشتنەکەم دا و بە پێی پیادە بەرەو پردی ترانیبێری شۆڕ بوومەوە. ئێمە کـە تەمەنم چوار یان پێنج سـاڵان بوو، جـارێک لە جاران، هـاوینێکیـان لەوێ ژیابووین. لەوێ من یەکەمین ئاببۆرە گچکەی خۆم بە دەرزییەکی سەر خڕ ڕاو کـردبوو. ڕێک ئـەو پنتـەشم لـە بیـرە کـە لێی ڕاوەسـتـابووم. وا ئـێـسـتـاش بۆ مـاوەیەکی درێژ لەوێدا ڕاوەستام و بۆنی ئاشنای ئاوە وەستاوەکە و قیری بە هەتاو وشکەوەبووم هەڵمژت. هەنووکە وەک بڵێی ئاببۆرە گچکەی گورجوگۆڵ بە پەلە لە ئاوەکەدا بێن و بچن. لە یادمە ئەو جارە چۆن تەماعکارانە تەماشام دەکردن و چ پەرۆش ئاواتم دەخـواست کە بمتوانیبا بمگرتبان. کاتێ دواجار توانیم ئابوورە گچکەیەک، کـە بەحـاڵ درێژییـەکـەی سێ ئینـج دەبوو، بگرم، بە قـولاپەکـەوە خـۆی ڕادەپسکاند، من لە خـۆشـیدا شـێـتـانە هاوارم دەکـرد و بە ماسییە بچکۆلانەکەمەوە کە لەنێو لەپی دەستە نوقاوەکەمدا خۆی ڕادەپسکاند و دەلەرزی، ڕێک ڕام کردەوە بۆ مـاڵەوە بـۆ لای دایکم... حـەزم دەکرد بۆ شـێـو بیخۆین، بەڵام دایکم دای بە پشیلەکە. ئەوەش هـەر خۆش بوو کـە ببینیت چۆن پشـیلەکـە گـەمـەی پێ دەکـا و پاشـان گـوێت لێ بێ کـە چۆن ئێسکەکـانی لە نێوان ددانە دڕندانەکەیدا دەردەپەڕین.

لە ڕێگادا بەرەو ماڵەوە خـۆم کرد بە "پێپرسکا مورن"دا تا شـێو بکەم. هیچ

لەو بڕوایەدا نەبووم لەوێ ناسیاوێک ببینم، بەڵام دوو پزیشک لەوێ دانیشتبوون و ئاماژەیان بۆ کردم بچم لەلایان دانیشم. تەنیا پەرداخێک بیرەی کەمڕەنگم لەلایان خواردەوە و ئیدی ڕۆیشتم.

چی لەم کاخەزانە بکەم؟ تا ئێستا وا ڕاهاتووم لە چەکمەچەی مێزی نووسینەکەمدا دایاندەنێم، بەڵام ئەوە شتێکی باش نییە. تەنیا چاوێکی تیژی دنیادیدە کە مێزیکی ئاوها کۆن دەبینێت، دەسبەجێ خەیاڵی بۆ ئەوە دەچێ کە دەبێ چەکمەچەی نهێنی هەبێ و ئیدی بە هاسانی پەی پێ دەبات. گەر سەرەڕای هەموو ئەمانە، شتێک رووبدات، شتێک کە ناتوانرێ پێشبینی بکرێت، کەسێک ئەو بیرۆکەیەی بۆ بێت کە ماڵەکەم تەحەڕی بکرێت، ئەوسا دەسبەجێ پەڕە نووسینەکان لەوێدا دەدۆزرێنەوە. ئەدی باشە چۆن خۆمیان لێ ڕزگار بکەم؟ دەزانم: ژمارەیەک کارتۆنم لەسەر ڕەفەی کتێبەکان هەن، لە شێوەی کتێبدان و پڕن لە یاداشتی زانستی و کاخەزی کۆنی تر کە بەشێوەیەکی ورد ڕێک خراون و لەیبڵ دراوە لە پشتەکانیان. دەتوانم لەگەڵ ئەو یاداشتانەی تردا کە لەبارەی ژینۆکۆلۆژیی(*)ەوەن لەیەک بنێم. دەشتوانم لەگەڵ کۆنە کاخەزی دەفتەری یاداشتەکانمدا تێکەڵاویان بکەم، هەڵبەت من پێشتریش یاداشتم نووسیوەتەوە، بەڵام هەرگیز بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و بۆ ماوەیەکی درێژ نا، بگرە ماوە ماوە... بەهەرحاڵ با وابێ بزانین دوایی چ دەبێت. هەمیشە کاتم بە دەستەوەیە کە ئەگەر پێویست بکات دەتوانم بیانسووتێنم.

**

ئیدی تەواو بووم، من ئازادم. ئیدی حەز دەکەم ئەمە لە خۆم بتەکێنم، ئیدی دەمەوێ بیر لە شتێکی تر بکەمەوە.

ئا - بیر لە چی؟

---

(*) زانستی تایبەت بەو نەخۆشی و نارەحەتییانەی کە پێوەندییان بە ئامرازی زاوزێ و منداڵدانەوە هەیە. و. کوردی

من شـەکەت و بەتاڵ بوومـەتەوە. هـەست دەکەم تەواوێک بەتاڵ بوومـەتەوە. وەک تلۆقێک کە کونێکی تێ بووبێ.

برسـیمـە، ئەوە هـەموو مـەسـەلەکەیە. با کـریسـتین شێوەکە گـەرم بکاتەوە و بۆم بهێنێ.

## ٢٣ی ئۆگۆستی

بە درێژاییی شـــەو باران دەباری و با هـەڵی کـردبـوو. ئەوە یەکـــەمین زریـانی پـایـزە. بە خـــەبـەر ڕاکـشـابـووم و دەنگی لێک سـیـرکـاندنی دوو پەلکی دار کەستانـەکەی نزیک پەنجەرەکەم دەژنەوت. بیرمە کە هەستام و بۆ تاوێک لەبەر پەنجـەرەکـەدا دانیـشـتـم و گـەواڵە هـەورەکـانم بینـین یەکـتـریان ڕاو دەنا. ڕەنگدانـەوەی لەمـپـا گـازییـەکـان لەسـەریان شـــەوقـێکی بـە ڕەنگی خـشـتـی سوورئاسـا و سووتاوی پیسـی پێ بەخشـیبوون. پێم وابوو گۆپاڵی سەڵتەنەتی کڵێسا خۆی بۆ زریانەکە نەوی کردووە. هـەورەکان قڵافەیان دەنواند، بووبوونە نێچیرێکی کێوی شـەیتانگەلی پیس و سـوور کە فوویان بە شـەیپوورەکاندا دەکرد و فیکەیان دەکـێشـا و دەیانقیـژاند و شـڕوشـیتـاڵیـان لەبەری یەکدیدا دادەدڕی و هـەمـوو جـۆرە فـسق و فـجـورێکیـان دەکـرد. کـاتێ کـە لـەوێدا دانیشـتبـووم، لە ناکاوێکڕا دامـە قاقـای پێکەنین: بە زریانەکە پێ دەکەنیم. پێم وابوو مـەسـەلەکەی زۆر بە جیدی وەرگرتووە. وەک ئەو جـوولەکـەیە وابووم کـە ڕێک لەو کاتەدا کـە پشتـە مەغزەیەکی بەرازی دەخـوارد، بروسکە لە زەویی دا: پێی وابوو ئەوە لەبەر ئەو کوتە گۆشـتی بەرازە بووە. بیرم لـە خۆم و بەزمـەکەم دەکردەوە و پێم وابوو زریانەکەش بیر لە هـەمـان شت دەکاتەوە. دواجار لەسـەر کـورسـیـیـەکـەم نووسـتم، لەرزێکی سـارد وەئـاگای هـێنامـەوە، چوومـە سـەر تەختـەنوێنەکەم، بەڵام چـی دی خەوم لـێ نەکەوت. ئیـدی دواجـار ڕۆژێکی نوێ هـات.

هـەنووکـە بەیانییـەکی خـۆڵەمێـشی و ئارامـە، بـەڵام هـەر دەبارێ و دەبارێ.

هەلامەتێکی خراپم گرتووە و تا ئێستا سێ دەسەسرِ بە ئاوی کەپووم تەڕ بوون.

کاتێ لەسەر مێزی قاوەخواردنەوە ڕۆژنامەی بەیانیم کردەوە، بینیم قەشە گریگۆریۆس مردووە. تەواوێک لەناکاو، بە سەکتە... لە دوکانی ئاو فرۆشییەکە لە کیونگستریسگۆردن... بە ڕێکەوت یەکێک لە بەنێوبانگترین دوکتۆرەکانمانی لەگەڵدا بووە، تەنیا توانیویەتی مردنەکە بسەلمێنێ... کۆچکردوو یەکێک لە هەرە خاوەن زۆرترین گوێگر و خۆشەویستترین واعیزانی پایتەخت بووە... خاوەن کەسێتییەکی لەبەردڵان و میهرەبان... پەنجاو هەشت ساڵ تەمەنی بوو... لە واللێر لەدایک بووە... هاوسەر و دایکە پیرەکەی بۆی لە پرسەدان.

ئۆف وایە، خوایە ئەوە ڕێگای هەموومانە. ئەو ماوەیەکی زۆر بوو نەخۆشیی دڵی هەبوو.

بەڵام کەواتە دایکێکی پیریشی هەیە. من ئەوەم نەدەزانی. دەبێ زۆر زۆر پیر بێت.

.... شتێک هەیە لەم ژوورەدا خەمین و دزێوە، بەتایبەتیش لەم ڕۆژە باراناوییانەدا. هەموو شتێکی ئێرە کۆن و تاریک و مۆرانە لێدراوە. بەڵام من حەزم لە مۆبلی تازە نییە. بەهەرحاڵ پێم وایە باشترە پەردەی تازە بۆ پەنجەرەکان بکرِم، ئەم پەردانەی ئێستا زۆر تاریک و قورسن و بەری ڕووناکی دەگرن. ئەم پەردەیەشیان شەوەکەی هاوین کەمێک قەراغەکەی سووتا، کاتێک بڵێسەی مۆمەکە لێی دا و ئاگری گرت.

"ئەو شەوەی هاوین"... لێ گەڕێ با بیربکەمەوە، دەبێ ئەوە چەندێک بێ ؟ –دوو هەفتەیە. دەی منیش پێم وایە یەک ئەبەدییەتە.

کێ دەیتوانی مەزەندە بکات کە دایکی لە ژیاندایە...

گەر ئێستا دایکم ژیابا دەبێ تەمەنی چەند بووایە؟ ئۆە، زۆر پیر نەدەبوو. ئەوپەڕەکەی شەست ساڵ دەبوو.

دەبێ پرچی سپی بایە. دەشێ کەمێک قورس بەسەر گردۆڵکە و پێپلیکانەکاندا سەرکەوتبا. چاوە شینەکانی کە لە چاوی هەر هەموو خەڵکانی تر ڕووناکتر بوون، دەبێ ئێستا بەهۆی تەمەنەوە ڕووناکتر بان و لەژێر پرچە سپییەکەیەوە میهرەبانانە زەردەخەنەیان بهاتایێ. دەبێ شادمان با بەوەی باش هاتووم، بەڵام دەبێ زیاتر بۆ ئێرنستی برام خەمین با کە لە ئوسترالیایە و قەت نامە نانووسێت. ئەو جگە لە خەمخواردن و نارەحەت بوون بۆ ئێرنیست، چ شتێکی تری نەبوو. لەبەرئەوە ئەوی زیاتر خۆش دەویست. –بەڵام کێ چوزانێ، گەر دایکم ژیابا ڕەنگە ئێرنست بووبووایەتە کەسێکی جیاواز.

زۆر زوو مرد، دایکم.

بەڵام خۆشە کە مردووە.

(دواتر..)

تازەکی کە لە خۆرئاوابووندا بۆ ماڵەوە گەڕامەوە، لەبەر دەرگای هۆڵەکەدا وشک هەڵهاتم. چەپکێک گوڵی تاریک لە پەرداخێکدا لەسەر مێزی بەردەم ئاوێنەکە بوو. بوولێڵە بوو. گوڵەکان ژوورەکەیان پڕ لە بۆنە قورسەکەی خۆیان کردبوو.

سوورەگوڵ بوون. سوورەگوڵی تاریک و سوورە گوڵی سوور. دووانیان تا ڕادەیەک ڕەش.

تەواوێک بێجووڵە لەو تاریکوڕوونەی ئەو ژوورە گەورە بێدەنگەدا ڕاوەستام و نەمدەوێرا بە حاڵ خۆم بجووڵێنم و بەحاڵ هەناسە بدەم. پێم وابوو خەونێک دەبینم. گوڵەکان لەبەردەم ئاوێنەکەدا – هەڵبەت ئەوانە ئەو گوڵە تاریکانەن کە لە خەوندا بینیبوومن.

بۆ ساتێک ترس دای گرتم. لە فیکرەوە چووم: ئەمە واهیمەیە، من ئیدی کەوتوومەتە ئەوەی تێک بشکێم، ئەمە ئیدی دەمگەیەنێتە کۆتایی. نەمدەوێرا بچمە پێشێ و گوڵەکان بە دەست بگرم لە ترسی ئەوەی کە نەبا هەوام بە دەستەوە بێت. چوومە ژووری ئیشکردنم. لەسەر مێزی نووسینەکە نامەیەک

دانرابوو. بە دەست و پەنجەی لەرزۆک نامەکەم هەڵپچڕی، بەخەیاڵی ئەوەی بەشکم جۆرە پێوەندییەکی بە گوڵەکانەوە هەبێت ، بەڵام داوەتنامەیەکی شێوکردن بوو. خوێندمەوە و وشەیەکم وەک وەڵام لەسەر کارتێک نووسی: "دێم". ئەوسا گەڕامەوە هۆڵەکە: گوڵەکان هەر لەوێ بوون. زەنگم بۆ کریستین لێ دا، دەمویست لێی بپرسم کە ئاخۆ کێ هاتووە و ئەم گوڵانەی هێناوە. بەڵام کەس بە دەم زەنگەکەمەوە نەهات، کریستین لە دەرەوە بوو. جگە لە خۆم کەسی تر لە ماڵەوە نەبوو.

ژیانم کەوتووەتە ئەوەی کە لەگەڵ خەونەکانمدا تێکەڵ دەبێ. چی دی ناتوانم خەون و ژیان لێکتر جوێ بکەمەوە. من شارەزای ئەمەم، من لە کتێبە گەورەکاندا شتم لەبارەی ئەمەوە خوێندووەتەوە: ئەمە سەرەتای کۆتاییە. بەڵام خۆ دەبێت کۆتاییی هەر بێت، منیش لە هیچ شتێک ناترسم. ژیانم زیاتر و زیاتر دەبێتە خەون. دەشێ جگە لەوە هەرگیز شتێکی تر نەبووبێت. دەشێ من بە درێژاییی کات خەونم بینیبێت، خەونم بینیبێ کە دوکتۆرم و ناوم "گلاس"ە و قەشەیەکیش هەیە ناوی گریگۆریۆس بووە. دەتوانم لەهەر کاتێکدا بێت وەک کەناسێک یان ئوسقوفێک یاخۆ قوتابییەکی قوتابخانە یان سەگێک وەئاگا بێمەوە – چوزانم...

ئا، قسەی قۆڕ. کاتێ خەون و پێش ئاگاداری دێنە دی، ئەمەش مەسەلەیەک نییە لەبارەی کارەکەر یان چەتیوێکەوە، بگرە لەبارەی تاکێکی بە شێوەیەکی باڵاتر ڕێکخراوەوەیە، ئەوسا دەروونناسی دەڵێ ئەوە ئاماژەیەکە بۆ سەرەتای سەرلێشێوانی رۆحی. بەڵام ئەوە چۆن ڕاڤە بکرێت؟ ئاوها ڕاڤە دەکرێت کە مرۆڤ لە زوربەی زۆری جارەکاندا هەرگیز خەونی نەبینیوە کە "بێتە دی"، بنیادەم پێی وایە خەونی بەوەوە بینیوە، یا جارێک لە جاران تەواوێک ئەزموونی ئەوەی بە وردەکارییەکانییەوە کردووە. بەڵام خەونەکەی من بەو گوڵە تاریکانەوە، یاداشتم کردوون! ئیدی ئەوە گوڵەکان خۆیانن، وڕێنە نین، ئەوان لەوێدان و بۆنیان دێ و زیندوون، کەسێکیش هاتووە و لەگەڵ خۆیدا هێناونی.

بەڵام کێ؟ هەڵبەت تەنیا یەکێک کە پێشبینی بکرێت. کەواتە بڵێی لە مەسەلەکە حاڵی بووبێ؟ حاڵی بووە و پێی خۆش بووە و پاشان ئەم گوڵانەی وەک ئاماژەیەک و وەک سوپاسێک ناردووە؟ ئەمە هەڵبەت دێوانەییە، ئەمە مەحاڵە. شتێکی ئاوها ڕوونادات، نابێت ڕووبدات. ئەمە شتێکی بێ ئەندازە ترسناکە. ئەمە شتێکی شایستە نییە. دەبێ ژنێک لەوە تێ بگات کە سنوورێکی هەیە! خۆ ئەگەر وابێت، ئەوا من چی تر لە هیچ تێ ناگەم، نامەوێت چی دی گەمە بکەم.

لەگەڵ ئەوەشدا گوڵەکان جوانن. دەبێ لەسەر مێزی نووسینەکەم دایاننێم؟ نەء. با هەر لەو شوێنەدا بن کە لێین. نامەوێ دەستیان لێ بدەم. لێیان دەترسم. من دەترسم.

## ٢٤ی ئۆگۆستی

هەڵامەتەکەم بووەتە سووکە ئەنفلۆنزایەک. دەرگاکەم بە ڕووی نەخۆشەکانمدا داخستووە تا لێمەوە نەیگرن و خۆم لە ژوورەوە قایم کردووە. وەڵامی نەچوونم بۆ داوەتی شێو لە ڕیوبنس گێڕاوەتەوە. هیچ شتێکم نییە بیکەم، تەنانەت خوێندنەوەش. تازەکی بە کاخەزی کۆنی قومار کە لە باوکمەوە بۆم ماوەتەوە، پاسێنیس(*) یکم کرد. وا بزانم یەک دەرزەن کاخەزی کۆنی قومار لە چەکمەجەی ئەو مێزە ماهۆنییە جوانەی قوماركردندا هەن، گەر یەک نەخت ئارەزووی قومارم هەبا، ئەوا ئەو مێزە بە تەنیا دەیتوانی بەرەو نابووتبوونم بەرێت. کاتێ مرۆڤ دەیکاتەوە، سەفحەکەی لە بەرگێکی سەوز گیراوە، چاڵی درێژکۆلە لە قەراخەکانیدا بۆ نیشانەکان هەیە و بەشێوەیەکی ناسک موساییک کراوە.

بەڵێ، شتی لەوە گەورەتریشم لە باوکی میهرەبانمەوە بە میرات بۆ جێ نەماوە.

---

(*) patiens: جۆرە یاریەکە بە کارتی قومار. و. کوردی

باران و باران... ئەوەی دەبارێ ئاو نییە، بگرە پیسییە. ئەتمۆسفارەکە چی دی خۆڵەمێشیی نییە، بگرە قاوەیییە. کاتێکیش بارانەکە بۆ تاوێک خۆش دەکاتەوە، بە زەردێکی پیس ڕووناک دەبێتەوە.

پەڕی سوورەگوڵێکی ژاکاو بەسەر کاخەزی پاسینیسەکەدا، لەسەر مێزەکەم کەوتووە. نازانم بۆچی دانیشتووم و پەڕی ئەو گوڵەم لێ کردووەتەوە. دەشێ لەبەرئەوەبێ بیرم لەوە دەکردەوە کە ئێمە بە منداڵی جاران وا ڕاهاتبووین پەڕی سووره گوڵمان لە دەسکەوانێکدا دەکوتی و پاشان لوولمان دەکرد و دەمانکردە هەڵماتی ڕەق، پاشان بە دەزوومانەوە دەکردن و وەک ملوانکە لە جێژنی لەدایکبوونیدا، دەماندایە دایکمان. ئەو هەڵماتانە بۆنێکی گەلێک خۆشیان لێ دەهات. بەڵام دوای چەند ڕۆژێک وەک کشمیش هەڵدەچروسکان و فڕێ دەدران.

سووره گوڵەکان – ئا، ئێستا ئەوەیش چیرۆکێکی خۆی هەیە. ئەم بەیانییە هەر کە خۆم بە هۆڵەکەدا کرد، یەکەمین شتێک بینیم، کارتێکی سەردان بوو کە لەسەر ئاوێنەی مێزەکە لە نزیک پەرداخی گوڵەکانەوە دانرابوو: ئێڤا مێرتێنس. تا ئەم ساتە تێ ناگەم دوێنێ چۆن نەمتوانیوە بیبینم. چۆناوچۆنیش کچێکی ئاوها میهرەبان و جوان بە خەیاڵیدا هاتووە لەبەری ئەوبەری دۆزەخەوە گوڵ بۆ گوناهبارێکی تووڕەهاتی وەک من بنێرێت. دیارە ئەگەر زەینی تیژم بگوشم و بەسەر شەرمنیمدا زاڵ ببم دەتوانم هۆکاری قووڵی ئەو گوڵناردنە هەڵبێنم، بەڵام هۆکارە سەرەکییەکەی چییە؟ بەهانەکەی چییە؟ هەرچەند دەیهێنم و دەیبەم ناتوانم جگە لەم ڕاڤەیە هیچ ڕاڤەیەکی تری بۆ بکەم: ئەو خوێندوویەتییەوە یان بیستوویەتی باسیان کردووە کە من چۆن لەو ساتی مردنە خەمینەدا ئامادەبووم. ئەو پێی وایە من بە قووڵی پەشۆکاوم، بۆیە حەزی کردووە ئەم بەڵگەیەم وەک دەربڕینی هاوهەستی خۆی بۆ بنێرێت. ئەو بە شێوەیەکی کتوپڕ و لە خۆوە ئەم کارەی کردووە و پێی شتێکی سروشتی بووە. ئەم کیژە خاوەن دڵێکی میهرەبانە...

ئەدی ئەگەر لێ گەڕێم خۆشی بوێم؟ من زۆر تەنیام. زستانی ڕابردوو

پشیلەیەکی بۆری خەتخەتم هەبوو، بەڵام دەمەو بەهار تێی تەقاند. ئێستا ئەوم بیر دەکەوێتەوە، کاتێ تیشکی یەکەمین کوانووی پایز لەسەر فەرشە سوورە بلێسەییەکە سەمای دەکرد: ڕێک لەوێدا لەبەر ئاگردانەکەدا ڕادەکشا و بە نازەوە دەیمیاواند. بێهودە هەوڵم دەدا سەرنج و میهری بەلای خۆمدا ڕاکێشم. ئەو شیرەکەی منی دەخواردەوە و خۆی لەبەر ئاگرەکەی مندا گەرم دەکردەوە، بەڵام دڵی هەر بە ساردی بەرامبەرم مایەوە. پشەکە چیت لێ هات؟ تۆ پشیلەیەکی نارەسەن بوویت. دەترسم گەر هێشتا لەم دنیایەدا زیندوو بیت، لە بەدرەوشتییەوە گلابیت. شەوێ گوێم لە پشیلەیەک بوو لە گۆڕستانەکەدا دەیقیژاند، هەر تەواو پێم وابوو کە دەنگتم ناسیوەتەوە.

**

کێ بوو گوتی: "ژیان کورتە، بەڵام سەعاتەکان درێژن". دەبێ ماتماتیکییەکی وەک پاسکاڵ بووبێت، بەڵام هەڵبەت فێنێلۆن بووە. حەیف کە من نەبووم.

**

بۆچی من تینووی کارێک بووم؟ دەشێ بە زۆری لەبەرئەوە بووبێ تا غەمم هەتوان بکەم. "Lennui commun a toute creature bien nee"، وەک شاژنە مارگۆتی ناڤاررا دەڵێ. بەڵام کاتێک ئەوەی گوتووە کە غەم ئیمتیازێک بووە بۆ "بوونەوەرانی ڕەسەن". بەگوێرەی خۆم و هەندێک کەسی تر کە دەیانناسم، وا پێ دەچێ لەگەڵ گەشەکردنی ڕووناکبیری و گوزەرانخۆشیدا، غەمیش لەناو عەوامدا لە بڵاوبوونەوەدابێ.

کردار وەک هەورێکی گەورەی سەیر بۆم هات، بروسکەیەکی دا و تێ پەڕی. غەمیش هەر مایەوە.

بەڵام هەروەها ئەمە کەشوهەوایەکی تەواو ئەنفلۆنزاییە. لە ڕۆژانێکی ئاوهادا پێم وایە بۆنی مەیتی کۆن لە قەبرسانەکەوە بەرزدەبێتەوە و لە دیوار و پەنجەرەکانەوە دزە دەکاتە ژوورەوە. باران بەسەر پلۆتی ڕۆخی پەنجەرەدا دڵۆپە دەکا. هەست دەکەم دڵۆپە دەکاتە مێشکمەوە تا هەڵی کۆڵێ. هەڵەیەک لە

مێشکمدا هەیە. نازانم ئاخۆ زۆر خراپە یان زۆر باشە، بەڵام وەک ئەوە نییە کە پێویستە وابێ. لەبری ئەوە لانی کەم دەزانم دڵم لە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیدایە. دڵۆپ – دڵۆپ – دڵۆپ. بۆچی ئەو دوو درەختە بچووکەی لای گۆڕەکەی "بێلمان"ەوە هێند لاواز و ڕووتەڵەن؟ لەو بڕوایەدام نەخۆشن. ڕەنگە بە گاز ژەهراوی بووبن. ئەو، ئەو کارل میکایلە پیرە دەبوو لە ژێر درەختی گەورەدا، کە با بەناویدا وژەی هاتبا، نووستبا. نووستبا؟ بەڵێ – چما بۆمان هەیە بنووین؟ هەر بە ڕاست؟ ئەو کەسەی ئەمەی دەزانی... دوو دێڕ لە شیعرێکی بەنێوبانگم وەبیردێتەوە:

Lombre dun vieux poete erre dana la gouttiere

Avec la triste voix dun fantome frileeux.

"سێبەرێکی شاعیری پیر لەسەربانی کەناڵۆکە سەرگەردانە بە دەنگێکی خەمینەوە هی تارماییەکی بە شەختەبوو".

بۆدلێر بەختی هەبوو کە ناچار نەبوو ئەم شیعرە بە سوێدی بژنەوێت. بە گشتی چ زمانێکی بە نەفرەتبوومان هەیە. وشەکان پێ بە قاچی یەکتردا دەنێن و یەکتر پاڵ دەنێنە ناو ئاوەڕۆی جادەوە. هەموو شتێک کاڵ و بەرچاوە. نە نیو تۆنییەک، نە سووکە ئاماژە و نە نەرمە گوزەر. زمانێک کە پێ دەچێ دروست بووبێ تا عەوام لەو خووە ڕیشەکێش نەکردەیەدا بۆ ئاشکراکردنی حەقیقەت، لەهەموو کەشوهەوایەکدا بەکاری بهێنن.

تا بێت زیاتر و زیاتر تاریک دادێ: تاریکیی دیسەمبەر لە ئۆگۆستیدا. پەڕی سووره گوڵە ڕەشەکان سیس بوون. بەڵام کاخەزی قومارەکان لەسەر مێزەکەم لەو دۆخە خۆڵەمێشییەدا، بە ڕەنگێکی درەوشاوەی دەم بەپێکەنین پرشنگ دەدەن، وەک بڵێی بیرم بهێننەوە کە ئەوانە جارێک لە جاران دروست کراون تا دڵتەنگیی شازادەیەکی نەخۆش و دێوانە برەوێننەوە. بەڵام من تەنیا بە بیر لێکردنەوەی ئەوەی کە ئەم کاخەزی قومارانە کۆکەمەوە و ئاوەژوو دایاننێم و بە پاسیێنسێکی نوێ تێکەڵیان بکەم، زەندەقم دەچێ، تەنیا دەتوانم دانیشم و تەماشایان بکەم و گوێ ڕادێرم کە چۆن "سەربازی دڵ و خاتوونی قەرە،

خەمگین بە چرپە لەبارەی عیشقە لەگۆڕنراوەکەی خۆیەوە دەدوێ"، وەک لە هەمان سۆناتادا هاتووە.

Le beau de coeur st la dame de pique

Causent sinistrement de leurs amours defunts

گەر ئارەزووم هەبایە هەستامایە و بەرەو کاولە کۆنە پیسەکەی ئەو قوژبنە ڕۆیشتبام و بیرەم لەگەڵ کیژاندا خواردبایەوە. پایپێکی تاڵم کێشابا و قەرەیەکم لەگەڵ ژنە خانەخوێدا ڕاکێشابا و ئامۆژگاریی بەسوودم لەبارەی ڕۆماتیزمەکەیەوە پێ دابا. ئەو هەفتەی ڕابردوو لێرە بوو، گلەییی لەبارەی بێدرەتانی و قەڵەوی و زلیی خۆیەوە هەبوو. بەرمووریێکی گەورەی ئاڵتوونیی بەژێر چەناگەوە و پێنج کرۆنییەکی حەقدەسی سەردانەکەیدا. ئەو بە سەردانێکی بەرامبەر دڵخۆش دەبێت.

لە زەنگی دەرگای دەرەوە دەدرێت. ئێستا کریستین دەیکاتەوە... دەبێ کێ بێ؟ هەڵبەت من گوتوومە ئەمڕۆ پێشوازیی کەس ناکەم... پۆلیسێکی پشکنەرە؟... کە وا خۆی دەنوێنێ نەخۆشە، وەک نەخۆش خۆی دەخاتە ڕوو... دەی وەرە ژوورەوە پیرەمێردەکەم، هەڵبەت چارەت دەکەم...

کریستین دەرگاکەی کەلا کرد و نامەیەکی بە لێواری ڕەشەوە لەسەر مێزەکەم فڕێ دا. بانگهێشتن بۆ ئامادەبوون لە ڕێوڕەسمی بەخاک سپاردندا.

**

.... سەبارەت بە کارەکەم، بەڵێ.... "ئەگەر جەناب ئەم چیرۆکەی بە قەسیدەیەکی قارەمانیی گەرەکە، ئەوا هەشت شیلینگی تێ دەچێت..."

**٢٥ی ئۆگۆستی**

قلافەگەلێکی تافی جاحێڵیم لە خەوندا بینین. ئەو کیژەم بینی کە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر لە ناوەڕاستی هاوینێکدا ماچیم کرد، ئەوە کاتێک بوو کە گەنج بووم و کەسم نەکوشتبوو. هەروەها ئەو کیژە گەنجانەی تریشم بینین، کە سەر

به پێڕەکەی ئێمە بوون، یەکێکیان ئەو ساڵەی من بووم بە قوتابیی زانکۆ، ئەو چوو ئایینی خوێند. ئەو هەمیشە دەیویست لەبارەی ئاینەوە قسانم لەگەڵدا بکات، یەکێکی تریان کە لە من بە تەمەنتر بوو، حەزی دەکرد خۆرنشینان لەودیو پەرژینی گوڵە یاسەمینی باخچەکەمانەوە لەگەڵمدا ڕاوەستێ و بە چرپە بدوێ، یەکێکی دییان کە هەمیشە مەسخەرەی پێ دەکردم، کاتێک جارێکیان منیش مەسخەرەم پێ کرد، ئەو هێند تووڕە و تاوی سەند، کە بەگرژی کوڵی گریانی بەربوو... ئەوانەی لە خەونەکەمدا بینیمن ڕەنگ پەڕیوبوون لە خۆرنشینێکی ڕەنگپەڕیودا، چاوانیان زەق و ترسێنەر بوو. کاتێک لێیان نزیک بوومەوە، ئاماژەیان بۆ یەکدی دەکرد. دەمویست قسانیان لەگەڵدا بکەم، بەڵام ئەوان ڕوویان وەردەگێڕا و وەڵامیان نەدەدامەوە. لە خەونەکەدا بیرم کردەوە، ئەوە تەواو شتێکی سروشتییە، چونکە نامناسنەوە، ئاخر من زۆر گۆڕاوم. بەڵام لە هەمان کاتدا حاڵی بووم لەوەی کە من خۆم فریوداوە و ئەوانە زۆر باش دەمناسنەوە.

کاتێ وەئاگا بوومەوە، کوڵی گریانم بەربوو.

## ٢٧ی ئۆگۆستی

ئەمڕۆ ڕێوڕەسمی بەخاک سپاردنەکەیە لە کڵێسای یاکوب.

ڕۆیشتم بۆ ئەوێ: دەمویست ئەو ببینم. حەزم دەکرد بزانم ئاخۆ دەتوانم پزیسکێک لە ئەستێرەی چاوانی لەمیانەی ڕووپۆشەکەیەوە وەگیرخەم. بەڵام ئەو بە چارشێوە ڕەشەکەیەوە سەری داگرتبوو و پێڵووی هەڵنەدەبڕی.

قەشەی جێبەجێکەری ڕێوڕەسمەکە لە کتێبی سیراکی مەسیحەوە دەستی پێ کرد: "لە بەیانییەوە تا ئێوارە دەکرێ شتی زۆر بگۆڕدرێ و خواش هەموو شتێک بە خێرایی ئاڵوگۆڕ پێ دەکات". ئەو بەوەی کە زارۆکێکی جیهانە بەهای هەیە. ئەوەش ڕاستە کە من زۆر جاران سەروکەڵلە بریقەدارەکەیم لە ریزی شانۆدا بینیوە کە پرشنگی داوە، دەستوپلە سپییەکەی بۆ چەپڵەی بە

نەزاکەتانە ئامادەکردووە. بەڵام ئەو نوتقدەرێکی ڕۆحیی لێزانە و بە ئاشکرا دیارە کە خۆیشی بە قووڵی کەوتووەتە ژێر هەژمووونی ئەو وشە دێرینانەوە کە لە بەندی مەزەندە نەکردەی نەوەکان، لە مردنە چاوەڕواننەکراوەکان و کردنەوەی دەستوبردی گۆڕەکاندا دەنگی داوەتەوە و گوزارشتێکی ئاوها ڕاچڵەکێنەری لای زارۆکانی ئینسان بە ترس لەو دەستە نەناسراوە وروژاندووە کە وەک سێبەر باڵی بەسەر دنیاکەیاندا کێشاوە و بە هەمان ڕەمز و ڕازئامێزانە، شەو و ڕۆژ و ژیان و مردنی بۆ ناردوون. قەشە گوتی: "ڕاوەستان و نەگۆڕان بە ئێمە نەبەخشراوە. ئەوە چ کەڵکێکی بۆ ئێمە نییە، ئەوە شتێکی نەگونجاوە، تەنانەت شتێکە بەرگەنەگیراو. یاسای گۆڕان تەنێ یاسای مەرگ نییە: بگرە بەر لە هەر شتێک یاسای ژیانە. کەچی ئێمە هەموو جارێک هەمان لەرز و ڕاچڵەکین دامان دەگرێت، کاتێک سەرلەنوێ لەبەردەم گۆڕاندا ڕادەوەستین، کاتێ دەبینین هێند لەناکاوڕا کامڵ و جودایە لەوەی کە ئێمە بیرمان لێ کردووەتەوە... برایانم، نەدەبوو وا بێ. ئێمە دەبوو بیربکەینەوە: مەولا دەیزانی میوەکە گەییوە، بەڵام لەبەر چاوانی ئێمەدا وا نەبوو، لێ گەڕا میوەکە بکەوێتە دەستی ئەوەوە"... هەستم کرد چاوم تەڕ بووە و ورووژانی خۆم بە کڵاوەکەم حەشاردا. لەم ساتەوەختەدا تا ڕادەیەک تەواو ئەوەم بیرچووەوە کە دەمزانی لەبارەی هۆکاری ئەوەی میوەکە، کە ئەوەندە خێرا گەیی و بەربووەوە... یان ڕاستتر: هەستم دەکرد من لە بناخەوەڕا شتی زیاتر لە کەسێکی تر لەو بارەیەوە نازانم. تەنیا شتێکی کەمم لەبارەی بەهانە و هەلومەرجە نێزیکترەکانەوە دەزانی، بەڵام لەودیویانەوە زنجیری درێژی بەهانە لە تاریکیدا بزر دەبوو. هەستم دەکرد (کار)ەکەم ئەڵقەیەکە لە زنجیرێک، شەپۆلێکە لە جوڵانەوەیەک، زنجیرێک و جوڵانەوەیەک کە زۆر بەر لە یەکەمین بیرکردنەوەم و زۆر بەر لەو ڕۆژەی کە باوکم بۆ یەکەمین جار بە تامەزرۆییەوە لە دایکم بنۆڕێ، ڕۆنرابوو. هەستم بە یاسای ناچاری کرد: بە جەستە هەستم پێ کرد وەک تەزوویەک بە مۆخ و ئێسکدا. هەستم بە هیچ گوناهێک نەدەکرد. هیچ گوناهێک نییە. ئەو تەزووەی هەستم پێ کرد، وەک

ئەو تەزووە وابوو کە جاروبار لە مۆسیقایەکی زۆر گەورە و جیدییەوە یان لە ئەندێشەگەلی زۆر تەنیا و ڕووناکەوە هەستی پێ دەکەم.

ساڵەهابوو نەچووبووم بۆ کڵێسا. بیرم دێ کە چۆن وەک کوڕێکی پازدە ساڵان لەسەر هەمان ئەم کورسییانە دانیشتم و لە تووڕەییدا ددانم جیڕکردبووەوە بەرامبەر ئەو تاوانکارە قەڵەوە قەرە قۆزەی لای ئەڵتارەکە و لەگەڵ خۆمدا بیرم دەکردەوە، کە دەشێ ئەم ساختەچیەتییە تا بیست، ئەوپەڕەکەی تا سی ساڵی تر بڕبکات. جارێکیان لەمیانەی وەعزێکی درێژ و بێزارکەردا ئەو بڕیارەم دا کە من خۆیشم ببمە قەشە. پێم وابوو هەموو ئەو قەشانەی بینیومن و گوێم لێیان بووە، تەڵەکەبازن و من دەتوانم هەموو ئەو شتانە زۆر لەوان باشتر بکەم. من دەبێ بەرزببمەوە و ببمە ئوسقۆف و ئوسقۆفی گەورە. ئینجا کاتێ دەبمە ئوسقۆفی گەورە ئەوسا خەڵک گوێیان لە وەعزی خۆش خۆش دەبێت! ئەوسا کڵێسای گەورە لە ئۆپسالا جمەی دێت لە خەڵک! بەڵام بەرلەوەی قەشە بگاتە ئامین، ئیدی چیرۆکەکەم تەواو بوو: هاوڕێیەکی باشم لە قوتابخانە هەبوو کە لەگەڵیدا لەبارەی هەموو شتێکەوە دەدوام، من حەزم لە کچێک کردبوو، دایکم هێشتا لە ژیاندا بوو. بۆ ئەوەی بمتوانیبا ببمە ئوسقۆف هەڵبەت دەبوو درۆم کردبا و خۆم ڕەپێش دابا، ئەوەش شتێک بوو نەدەکرا. بنیادەم دەبێ خەڵکانێکی هەبن کە بەرامبەریان ڕاستگۆ بێت... ئای، خوایە لەو کاتانە، لەو ساتە پاقژانە... سەیرە کە دانیشیت و یادەوەریت بگەڕێنیتەوە بۆ دۆخ و زەینی ساڵانێکی زۆر لەمێژ. لە ساتێکی ئاوهادا مرۆڤ هەست بە خێراییی کات دەکات. یاسای گۆڕان، وەک قەشە گوتی (گەرچییش ئەوەی لە پیەسێکی ئێپسنەوە وەرگرتبوو). وەک ئەوە وایە کە وێنەیەکی فۆتۆی کۆنی خۆت ببینیت. من درێژەم بە بیرکردنەوەی خۆم دا: چەند کاتێکی درێژم ماوە تا لەخۆوە لەم دنیا مەتەڵئامێز و خەوناوی و لەنێو ئەو دیاردە بێ ڕاڤانەدا وێڵ بم؟ ڕەنگە بیست ساڵ، ڕەنگە زیاتر... بیست ساڵی تر من کێم...؟ گەر من لە شازدە ساڵیدا لە ڕێی جۆرێک لە جادووگەرییەوە ئەو ژیانەی ئێستای خۆم بینیبا، هەستم بە چی دەکرد؟ بیست

ساڵی تر، دە ساڵی تر من کێم؟ ئەوسا لەبارەی ژیانی ئەمڕۆمەوە چۆن بیر دەکەمەوە؟

ئەم ڕۆژانە چاوەڕێی ئێرینیێکان(*) بووم. ئەوان نەهاتوون. پێم وانییە هەبن. بەڵام کێ چوزانێ... دەشێ چ پەلەیان نەبێ. دەشێ پێیان وابێ کاتی باشیان بە دەستەوەیە. کێ چوزانێ لەمیانەی ساڵاندا چیم لەگەڵ دەکەن. ئەدی لە دەساڵی تردا من کێم؟

ئاوها خایلەم وەک پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگ دەفڕی کە ئیدی ڕێوڕەسمەکە بەرەو کۆتایی چوو. دەرگاکانی کڵێسا کرانەوە، بەدەم شەقە و ڕەقەی زەنگەکانەوە خەڵکەکە بەرەو دەروازەکە ترنجان، تابووتەکە لە گومبەزی دەروازەکەدا وەک کەشتییەک دەلەری و جۆلانەی دەکرد، بایەکی سازگاری پاییزی لێی دام. دەرەوە ئاسمان خەمین و خۆرێکی بێ تین و ڕەنگ پەڕیو، هەستم دەکرد نەختێک خەمین و بێ تین و ڕەنگ پەڕیوم، وەک کاتێ کە بنیادەم بۆ ماوەیەکی درێژ لە کڵێسایەکدا گیردەخوات، بەتایبەتیش کاتێ کە مەسەلەکە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن یان سروودی شامی عیسایی بێت. چووم بۆ گەرماوێکی لای "مالمتۆریگاتان"ەوە تا ساونایەکی فینلەندی بکەم.

کاتێ جلەکانم داکەند و خۆم بە ساوناکەدا کرد، دەنگێکی ئاشنام ژنەوت:

– ئێرە گەرم و خۆشە وەک نووسینگەیەکی فەرعیی بچووک لە دۆزەخ. ستینا! فلچە لێدان بە سێ دەقیقە!

ئەوە مارکێل بوو. لەسەر تاقێک دەستەوئەژنۆ دانیشتبوو سفت لەژێر میچەکەدا و بە ناتەواوی برِبڕە سوواوەکانی بە ڕۆژنامەیەکی تازەی ئافتونبلادێت حەشاردابوو.

کاتێ بینیمی، گوتی: "تەماشام مەکە. واعیز دەڵێ نابێ مرۆڤ تەماشای

---

(*) erinnyer: ژنە خواوەندانی تۆڵە لە میتۆلۆگیای گریکیدا کە بە دوای تاوانبارانەوەن و سزایان دەدەن. ژمارەی ئەو خواوەندانە دیار نییە، بەڵام یۆرپیدس بە سێ خواوەند دیاری کردوون. و. کوردی

قەشە و فشە ڕۆژنامەنووس بە ڕووتی بکات".

خاولییەکی تەڕم لە سەرمەوە پێچا و لەسەر سەکۆیەک درێژ بووم.

ئەو درێژەی دایێ: "هەر سەبارەت بە قەشەکان، وا بزانم ئەمڕۆ قەشە گریگۆریۆس بە خاک دەسپێردرێت. دەشێ لە کڵێسا بووبیت؟"

– بەڵی، هەر ئێستا لەوێوە هاتمەوە.

– کاتێ هەواڵی مردنەکەی هات من لە ڕۆژنامە خەفەر بووم. ئەو پیاوەی بە کورتە پەیامەکەوە هات، چیرۆکێکی درێژی سەرنج ڕاکێشی هۆنیبووەوە و ناوی تۆیشی تێ هەڵکێش کردبوو... من پێم وابوو پێویست بەوە ناکات. ئاخر دەمزانی تۆ زۆر گوێ نادەیتە ریکلام. من سەرلەنوێ پەیامەکە، هەر هەمووی دارشتەوە و زۆربەی زۆریم لابرد. وەک خۆت دەزانیت ڕۆژنامەکەمان نوێنەرایەتیی پرسی هۆشیاری دەکا و مردنی قەشەیەک بە سەکتە ناکاتە هەلا. بەلام بەهەرحاڵ هەر دەبێ چەند وشەیەکی جوان بگوترێ و ئەمەش بۆ من شتێکە کە هەمیشە کەمێک پێم زەحمەت بووە. هەڵبەت پەیامەکە خۆی "هاوهەستیی" پیشان دەدا، بەلام ئەوە بەس نەبوو. ئەوسا بیرم لەوە کردەوە کە دەشێ ئەو بەهۆی چەوریی دڵ یان شتێکی لەو بابەتە مردبێ، لەبەرئەوەی بە سەکتە مردووە، بۆیە بەمجۆرە کۆتاییم بە باسکردنی کارەکتەری ئەو هێنا: " خاوەن کەسێتییەکی لەبەردڵان و میهرەبان".

گوتم: "هاوڕێی ئازیز، تۆ خاوەن فەرمانێکی جوانیت".

وەلامی دامەوە: "بەڵێ، تۆ نابێ پێکەنینت بەمە بێت. دەی من دەبێ شتێکت پێ بڵێم: سێ جۆر خەڵک هەن – بیرکەرەوە، فشەڕۆژنامەنووس و ڕەشەولاخ. لە ڕاستیدا هەموو ئەوانەی کە پێیان دەگوترێ بیرکەرەوە و من بە شێوەیەکی پەنهان بە فشەڕۆژنامەنووسیان حیساب دەکەم، زۆربەی زۆری فشە ڕۆژنامەنووسانیش سەر بە ڕەشەولاخن، بەلام مەبەستەکە ئەمە نییە. ئامانجی بیرکەرەوان خولقاندنی ڕاستییە لە حەقیقەت کە لە خۆیدا زۆر کەم ناسراوە. بەلام من پێم وایە دەبێ وەک ڕۆژ دیاربێ – مەسەلەکە ئەوەیە حەقیقەت دەبێ وەک خۆر بێ: بەهاکەی بۆ ئێمە تەنیا و تەنیا ڕایەڵی مەودا ڕاستەکەیە. گەر

بیرکەرەوان بڕیار بەدەست بن، ئەوا ئەم گۆی زەوییەی ئێمە ڕێک بەرەو خۆر دەبەن و هەمــوومــان دەســووتێین و دەبینە خــۆڵەمـێش. ئەوە بەحــاڵ جــێگای سەرسوڕمانە کە چالاکییەکانی ئەوان ماوە ماوە زەندەقی ڕەشەولاخەکە بەرێت، بە شێوەیەک کە هاوار دەکات: خۆرەکە بکوژێنەوە، توو شەیتان بیکوژێنەوە، بیکوژێنەوە! ئێمەی فشە ڕۆژنامەنووسان ئەرکمان ئەوەیە کە ئەو مەودا ڕاست و بەکەڵکە لەگەڵ حەقیقەتدا بپارێزین. فشەڕۆژنامەنووسێکی هەر تەواو باش – کە ژمارەیان زۆر نین !– وەک بیرکەرەوە تێ دەگا و وەک ڕەشەولاخ هەست دەکات. ئەمە ئەرکی ئێمەیە کە لە بەرامبەر تووڕەیی ڕەشەولاخ بەرگری لە بیرکەرەوە و لە بەرامبەر ژەمۆکەی زیاد لە پێویست توندی حەقیقەت، بەرگری لە ڕەشەولاخ بکەین. بەڵام من بە خۆشحاڵییەوە پێی لێ دەنێم کە ئەم ئەرکەی دواییان ساناترە و لە یاسای ژیانی ڕۆژانەدا باشتر ئەنجامی دەدەین، هەروەها پێی لێ دەنێم کە ئێمە لەوەدا یارمەتییەکی بە بەها لەلایەن بیرکەرەوە تەزویرەکان و ڕەشە ولاخە ئاقڵترەکانەوە دەدرێین..."

وەڵامیم دایەوە: "مارکێلی ئازیز، تۆ قسەی ئاقڵانە دەکەیت، نائاگاش سووکە گومانێکم هەیە کە تۆ من نە لەسەر بیرکەرەوەکان حیساب دەکەیت و نە لەسەر ڕەشەولاخەکان، بگرە لەسەر جۆری سێیەم، هەر بۆیە زۆر مایەی چێژێکی واقیعییە کە نانی شێوت لەگەڵدا بخۆم. ئەو ڕۆژە شوومەی کە قەشەم لە دوکانی ئاوەکە بینی، پێشتر هەر بۆ هەمان مەبەست کون بەکون بە دوای تۆدا دەگەڕام. دەکرێ ئەمڕۆ دەسبەتاڵ بیت؟ ئەوسا دەچین بۆ هاسێلباکێن...؟"

مارکێل وەڵامی دامەوە: "بیرۆکەیەکی نایابە. بیرۆکەیەکە کە تەنیا بایی ئەوەندەیە بتخاتە ڕیزی بیرکەرەوەکانەوە. بیرکەرەوەگەلێک هەن، هێند ناسکن کە خۆیان لەنێو ڕەشەولاخاندا دەشارنەوە. ئەمانە زرنگترین جۆریانن و منیش هەمیشە وەک یەکێک لەوان حسابم کردوویت. کەنگێ؟ باشە، سەعات شەش، نایابە".

چوومەوە ماڵەوە تا خۆم لەو پانتۆڵە ڕەش و ملپێچە سپییە ڕزگار بکەم. لە ماڵەوە کتوپڕییەکی خۆش چاوەڕێم بوو: چاکەت و پانتۆڵە ڕەساسییە

تۆخـەکـەم، کـە هەفـتـەی ڕابردوو بەکـردم دابوو، تەواو بووبوو و بۆ مـاڵەوە نێردرابووەوە. هێلەکێکی شینیشی بە خاڵی سپییەوە لەگەڵدابوو. زەحمەت بوو جلکێک لەمە گونجاوتر بۆ شێوی هاسێلباکێن لە ڕۆژێکی خۆشی هاوینێکی درەنگدا وەدەس بخرێت. بەڵام من کەمێک نیگەرانی ڕوخسـار و قـڵافـەتی مارکێل بووم. لەبەرئەوەی ئەو لەم لایەنەوە هەر تەواو پێشبینی نەکراوە، ئەمڕۆ وەک دیپلۆماتێک خۆی دەگۆڕێ و سبەینێش وەک قورمساخێک. هەڵبەت ئەو هەموو خەڵک دەناسێ و وا ڕاهاتووە لە شوێنە گشتییەکاندا بە شێوەیەک دەرکەوێت وەک ئەوەی لە ژوورەکەی خۆیدا بێت. نیگەرانیی من نە بەهۆی خۆبینییەوەیە و نە بەهۆی ترس لە خەڵک: من پیاوێکی ناسراوم، خاوەن شوێنگەی خۆمم، گەر پێم خۆش بێت دەتوانم لەگەڵ عارەبانچییەکدا لە هاسێلباکێن شێو بکەم، هەرچی مارکێلیشە، هەمیشە هاوڕێیەتیکردنی ئەو هەستێک بەشەرافەتمەندیم پێ دەبەخشێ، بەبێ ئەوەی بیر لە جلەکانی بکەمەوە. بەڵام ئەوە هەستی جوانناسیم بریندار دەکات کە جلکێکی بێ دیقەت لای مێزێکی جوان ڕازاوەوە لە ڕێستۆرانتێکی جواندا ببینم. ئەوە نیوەی لەزەتەکەم بە با دەدا. پیاوانێکی زلحۆرت هەن کە حەز دەکەن گەورەییی خۆیان بەوە بشارنەوە، کە وەک شرەفرۆشێک خۆیان دەرخەن: ئەوە شتێکە مایەی شەرم.

وادەم لەگەڵ مارکێلدا لای کاتژمێرەکەی "تورنبێری"ییەوە دانا. هەستم دەکرد سووکەڵە و ئازادم، گەنج و نوێ بوومەتەوە وەک بڵێی لە نەخۆشییەک چاک بووبمەوە. ئەو هەوا پاییزییە سازگارە دەتگوت عەتری ساڵانی جاحێڵیی لێ دراوە. ڕەنگە ئەو بۆنە خۆشە لەو سیگارەوە هاتبێ کە کێشابووم. ئەو جۆرە سیگارەم دەس کەوتبوو کە جاران حەزم لێ دەکرد، بەڵام ساڵانێکی زۆر بوو نەمکێشابوو... مارکێلم لە خوڵقێکی درەوشاوەدا بینی بە ملپێچێکەوە کە لە پوولەکەی سەر پێستی سەوزی مارێک دەچوو، هێند جوانپۆش بوو، کە شا سلێمان بەو هەموو دڵڕفێنییەی خۆیەوە، لە شیکیدا قەت پێی نەدەگەیشتەوە. سەرکەوتینە نێو عارەبانەیەک، عارەبانەچییەکە بە قامچییەکەی سڵاوی کرد،

قامچییەکی وەشاند تا هەم خۆی و هەم ئەسپەکەی بەجۆش بخات و ئیدی کەوتینە ڕێ.

داوام لە مارکێل کرد کە تەلەفۆنێکی پێوەندی لە مێزێکی نزیک شیشبەندی بانیژەکەوە دابین بکات، لەبەرئەوەی ئەو لەو جێگەیەدا لە من زیاتر قسە ڕۆیشتووتر بوو. لەکاتێکدا کە بەرنامەمان دادەنا داوای شەرابی چابلیس، Potage a la chasseur, sjötungsfilet, vaktel, میوە، Manzanilla بکەین، کاتەکەمان بە پەرداخێک مەی، جووتێک ساردین و هەندێک زەیتوونی سوێرەوە بەسەربرد.

مارکێل پرسی: "ئەم پێنج شەممەیە نەهاتیت بۆ ڕیوبنس؟ خانەخوێ زۆر بیری دەکردیت. دەیگوت کە شێوازت لە بێدەنگییدا زۆر جوانە".

– هەلامەتم بوو. هیچ نەدەکرا بێم. لە ماڵەوە دانیشتم و بە درێژاییی بەیانییەکەی "پاتیێنس"م دەکرد، کاتی نیوەڕۆیش چوومە نێو جێگە. چ جۆرە خەڵکانێک لەوێ بوون؟

– کەربازاڕێکی تەواوبوو. "بیرک"یشی لێ بوو. توانی خۆی لە کرمەکەی قووتار بکات. ڕیوبن گێڕایەوە کە مەسەلەکە چۆن بووە: بیرک ماوەیەک لەوەو بەر بڕیارێکی فرە گرینگی داوە کە بنکە دەسەلاتدارییەکەی بە نەفرەت بکا و خۆی بۆ ئەدەبیات تەرخان بکات. کاتێ کرمەکە ئەو مەسەلەیەی بیستووە، ئیدی ئاژەڵە ئاقڵەکەیش بڕیاری خۆی داوە و خۆی بە بازاڕێکی تردا کردووە.

– ئێ، ئاخۆ ئەو لەگەڵ بڕیارەکەیدا جیدییە؟ مەبەستم لە "بیرک"ە؟

– نەء. ئەو دڵی بە بڕیارەکە خۆش دەکا و خۆی لە جێبەجێکردنی نادات. ئێستاش هەوڵ دەدا وا بسەلمێنێ کە ئەوە تەنیا فێڵێکی جەنگی بووە...

پێم وابوو شێوەی ڕوخساری "کلاس ڕیکێ"م لە مێزێکی ئەو دوورەوە کرد. هەر بە ڕاستی خۆی بوو. لە پارتییەی کارڕێ بوو لەگەڵ پیاوێکی تر و دوو خانمدا. هیچیانم نەدەناسین.

لە مارکێلم پرسی: "ئەوانە کێن کە لەو دوورەوە لەگەڵ ڕیکێدا دانیشتوون؟"

ئەو ئاورِی دایەوە و نەیتوانی نەرِیکێ ببینێ و نەهاونشینەکانی. ژاوەژاو لە دەوروبەرماندا بەرزبووەوە، لە پێشبرِکێ لەگەڵ ئۆرکێستراکەدا کە ئیدی کەوتبووە ژەنینی مارشی بولانگێر(*). مارکێل تاریک داهات. ئەو مەینەتبار بوو بە "دریفیوس"ەوە و لەو مۆسیقایەدا خۆپیشاندانێکی دژە دریفیوسی دەبینی، کە لەلایەن دەستەیەک ئەفسەری پلە نزمەوە رِێک خرابێ.

مارکێل درێژەی دایێ: "کلاس ریکێ دەڵێیت؟ نایبینم. بەڵام هەڵبەت لە دەرەوەیەوە و گاڵتەبازی لەگەڵ تازە خزمەکانیدا دەکات. پێم وایە بەم زووانە بەلەمەکەی لە بەندەردا لەنگەر پێ دەگرێ. کیژێکی پارەدار و خاوەن چاوانێکی زۆر جوان دڵی چووەتە سەری. سەبارەت بە چاوی جوان، خاتوو "میرتنس"ێکی گەنجم لەکاتی شێوکردندا لە ریوبنس لەلاوە دانیشتبوو. کیژێکی دڵگیر و تا بڵێی مەیلبەر. من هەرگیز لەوەوبەر ئەوم لەوێ نەبینیوە. بیرم نییە لە چییەوە بوو من ناوی تۆم هێنا، ئەوسا دەسبەجێ کاتێ بۆی روون بووەوە کە ئێمە هاورِێی نزیکی یەکترین، ئیدی بە درێژاییی کاتەکە تەنیا هەر باسی تۆی دەکرد و پرسیارگەلێکی لەبارەی تۆوە لێ کردم کە وەڵامەکانیانم نەدەزانین... ئەوسا لە ناکاوێکرا بێدەنگ بوو و نەرمایی گوێچکەی سوورهەڵگەرِا. من جگە لەوەی کە دەزانم ئەو خۆشی دەوێیت، لە هیچی تر تێ ناگەم".

هەڵم دایێ: "تۆ کەمێک لە ئەنجامگیرییەکانتا پەلەیت". بەڵام خەیاڵم لای ئەو قسەیەی بوو کە لەبارەی "رِیکێ"وە کردی. نەمدەزانی ئاخۆ باوەرِ بکەم: ئاخر مارکێل قسە زۆر دەکا و قسەکانیشی هیچیان تیا بەستە نین. ئەمەش لاوازییەکەیەتی. نامەوێ پرسیاریش بکەم. بەڵام ئەو هێشتا هەر لەبارەی

---

(*)Georges Boulanger (١٨٣٧– ١٨٩١) ژەنەراڵ و سیاسەتمەدارێکی فەرەنسییە. ساڵی ١٨٨٦ وەزیری جەنگ بووە. ساڵی ١٨٨٧ لە وەزارەت دوورکەوتەوە و خۆی بۆ سیاسەت تەرخان کرد و بووە پێشەنگی گرووپە نارِازییەکان. ساڵی ١٨٨٩ رِایکرد بۆ بەلژیکا و لەوی لەسەر گۆرِی دولبەرەکەی خۆی کوشت. و. کوردی

خاتوو "مێرتێنس"ەوە دەدوا، هێند گەرموگوڕ لەبارەیەوە دەدوا، کە ناچاربووم لەگەڵیدا بیکەمە سوعبەت:

– دیارە تۆ خۆت عاشقی بوویت، سەیر وا خەریکە هێلەکەکەت دەسووتێت! دەی مارکێلی ئازیز، بۆ خۆتی تەگبیرکە و منیش چ رکەبەرێکی ترسناک نیم. دەتوانی بە هاسانی بمکەیتە دەرەوەی سەحنەکە.

سەری بادا. وی جیدی و ڕەنگی پەڕی بوو. وەڵامی دامەوە:

– من لە دەرەوەی گەمەکەم.

هیچم نەگوت. بێدەنگی باڵی کێشا. گارسۆنەکە بە جیدیەتی خزمەتکارانی پەرستگەوە شەمپانیای هێنا. مۆسیقاکە کەوتە ژەنینی لۆهێنگرین[*]. هەوری ڕۆژ ڕامالرا و لەلای ئاسۆوە لە دەزوولەی ڕەنگ گوڵیدا خۆی ئەمبار دەکرد، بەلام لە سەرەوە فەزا بووە شینایییەکی قووڵ و بێکۆتایی، شین وەک ئەو مۆسیقا نایابە شینە. گوێم لە مۆسیقاکە ڕادێرا و خۆم لەبیر کرد. پێ دەچوو بیر و خایلەکانی ئەم دواییە و ئەو کارەی کە لێی کەوتەوە، بۆ دوور بەرەو ئەو شینایییە چووبێتن، وەک شتێک کە نەمابێ و کە خەونینە بووبێت، شتێک دەردرابێ و جوێ بووبێتەوە، کە چیدی لەوە زیاتر نیگەرانم ناکات. هەستم دەکرد کە من هەرگیز نە دەبێ و نە دەشتوانم بچمە ژێر کارێکی لەو جۆرەوە. چما کەواتە ئەوەی کردوومە خەیاڵپلاوی بووە؟ هەڵبەت من بە باشترین تێگەیشتنەوە مامەڵەم کردووە. کێشانەم کردووە و تاقیم کردووەتەوە، لەگەڵی و لە دژی. چوومەتە بنج و بنەوانی مەسەلەکەوە. چما خەیاڵپلاوی بووە؟ دەی ئێستا چ جیاوازیی نییە. لە ئۆرکێستەرەکەوە هەر ڕێک لەم کاتەدا ئەو تێمە پر لە نهێنییە بەرزبووەوە: "تۆ نابێ بپرسیت!" مەچۆ بنج و بنەوانی

---

(*) Lohengrin: قارەمانی ناو قەسیدەیەکی ئەڵمانییە کە لە دەوروبەری ساڵی ١٢٩٠دا نووسراوە و بووەتە بابەتی ئۆپێرایەکی ڤاگنەر بەهەمان ناو. ئەم ئۆپێرایە ساڵی ١٨٥٠ لە ئەڵمانیا و ساڵی ١٨٧٤ لە سوێد پێشکەش کراوە. و. کوردی.

شتەکانەوە: ئەوسا خۆت دەکەویتە بنەوە. بەدوای حەقیقەتدا مەگەڕێ: نایدۆزییەوە و خۆت زایە دەکەیت. "تۆ نابێ بپرسیت!" ئەو بڕە حەقیقەتە، کە بەکەڵکە یا پێشکەشت بێ، تێکەڵەیەکە لە درۆ و خەیاڵپلاوی، بەڵام ئەوە لەبەر تەندروستیی خۆتە نەبا هەناوت بسووتێنێت. هەوڵ مەدە درۆ لە ڕۆحتدا پاقژ بکەیتەوە، ئەوە شتی وای بە دوادا دێت کە مەزەندەت نەکردووە، تۆ هەم خۆت لە دەست دەدەیت و هەم هەموو ئەوانەش کە خۆشت دەوێن. "تۆ نابێ بپرسیت!"

مارکێل گوتی: "گەر مرۆڤ بودجەیەکی بوێت بۆ ئۆپێرا لە پارلەمان، ئەوا دەبێت بیخاتە مێشکیانەوە کە مۆسیقا "نفووزێکی جوانترکاریی" هەیە. من بۆ خۆم لەم سالانەدا شتێکی تووڕەهاتی هاوشێوەی ئەوەم لە سەروتارێکدا نووسی. وێڕای ئەوە ئەم بابەتە شتێک لە حەقیقەتی تێدایە، بەڵام دەبێ دەربڕینەکە بۆ یاسادانەرەکانی ئێمە قابیلی تەرجومە بێت. ئەوە بە زمانە ئۆرگیناڵەکە ئاوهایە: مۆسیقا دنە دەدا و هێز دەبەخشێ، بەرزدەکاتەوە و دەسەلمێنێت. زاهید لە بێ کەڵکییەکەیدا، جەنگاوەر لە ئازایەتییەکەیدا، تاوانبار لە تاوانەکانیدا، دەسەلمێنێ. ئۆسقۆف ئامبرۆسیۆس هاوڕەنگی لە مۆسیقای کلێسادا قەدەغە کردبوو، لەبەرئەوەی بە ئەزموونی کەسیەتیی خۆی بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە ئەوە خایلەی سێکسی دەوروژێنێت. لە سالانی ١٧٣٠دا قەشەیەک لە هاللی هەبوو کە لە مۆسیقای هیندێل(*) دا سەلماندنێکی ئاشکرای پەیامی ئاوگسبۆرگیی(**) بینی. من کتێبەکەم هەیە. ڤاگنەرییەکی

(*) Georg Friedrich Händel (١٦٨٥– ١٧٥٩) کۆنزەرڤاتورێکی ئەڵمانییە. سالانی ١٧١٩ تا ١٧٣٨ سەرەکیترین کارە ئۆپێراییەکانی نووسین، لەوانە: یۆلیۆ سیزار، ڕۆدێلیندا، ئورلاندۆ، خێرخیس لەگەڵ لارگۆ بەناوبانگەکەدا. و. کوردی

(**) augsburgiska bekännelsen یەکەمین کتێبی ئایینزای ئینجیلی لۆتەری کە لەلایەن میلانکتۆن–ەوە کاری تێدا کراوە و مارتین لۆتەر پەسەندی کردووە و لە شاری ئاوگوسبۆرگ دەرچووە. ئەو کتێبە ٢١ وتاری باوەڕی پەسەندی لەبارەی خودا و گوناهی میرات و کوڕی خوداوە لەخۆ گرتووە. و. کوردی

میهرەبانیش یەک فەلسەفەی تەواوی ژیان لەسەر مۆتیڤێک لە پارسیڤاڵ(*) رۆدەنێت."

کاتی قاوە خواردنەوەمان هات. پاکەتی سیگارەکەم بۆ مارکێل ڕایەڵ کرد. سیگارێکی لێ دەرهێنا و بە دیقەتەوە تەماشای کرد.

گوتی: "ئەم سیگارە شێوەیەکی جیدیی هەیە. وا دیارە سیگارێکی باشە. وەکی تر من لە مەسەلەی جگەرەدا کەمێک نیگەران بووم. تۆ خۆت وەک دوکتۆرێک هەڵبەت دەزانیت کە سیگارە باشەکان ژەهراویترینیانن. لەبەرئەوە من دڵ بە خورپە بووم، کە شتێکی قۆڕم دەدەیتێ".

وەڵامیم دایەوە: "هاوڕێی ئازیز، بە گوێرەی چەمکی خاوێنی بێ، ئەوا هەموو ئەم شێوکردنەی ئێستامان سووکایەتییە بە ئەقڵ. بەڵام سەبارەت بە جگەرەش، ئەوە پێوەندی بەو ئاراستە نهێنی ئامێزەی ناو پیشەسازیی تووتنەوە هەیە. ئەوە شتێکە تایبەت بە دەستەبژێران".

خەڵکەکە لە دەوروبەرماندا کەم بووبوونەوە. ڕووناکییە ئەلەکتریکییەکە هەڵکرابوو، دەرەوە خەریک بوو تاریکی دەکرد.

مارکێل لە ناکاوێکڕا گوتی: "با، وا ئێستا ڕێکێ دەبینم. لە ئاوێنەکەدا دەیبینم. ڕێک بە هاوڕێیەتی ئەو خاتوونەیە کە مەزەندەم کردبوو. ئەوانەی تر کە لەگەڵیدان، نایانناسم".

– باشە، ئەدی ئەو خاتوونە کێیە؟

– خاتوو "لێوینسۆن"ە، کچی ئەو دەڵاڵی فۆندەیە کە لەم ساڵدا مرد... ئەو خاوەنی نیو ملیۆنە.

– باشە پێت وایە رێکێ لەپێناوی پارەدا ژن بهێنێ...؟

– نا تکایە، نازانم. کلاس رێکێ پیاوێکی باشە. خەمت نەبێ ئەو یەکەم شت

---

(*) Parsifal ئۆپرا بەنێوبانگەکەی ڕیچارد ڤاگنەر. ساڵی ١٨٨٢ لە ئەڵمانیا و ساڵی ١٩١٧ لە ستۆکهۆڵم پێشکەش کراوە. و. کوردی

هەوڵ دەدا بە سۆزەوە عاشقی بێت و پاشان بە خۆشەویستی دەیهێنێ. مەسەلەکە وا جوان ڕێک دەخات کە تا ڕادەیەک پارەکە دەبێتە شتێکی کتوپڕ.

– تۆ ئەو خاتوونە دەناسیت؟

– یەک دوو جارێک بە دیداری گەیشتووم. تا بڵێی جوانە. تەنیا ئێسکی کەپووی کەمێک تیژە و ئەقڵیشی بەهەمان شێوە. خانمێکی گەنج کە سەرڕاستانە لەنێوان سپێنسێر(*) و نیچەدا دێت و دەچێ و دەڵێ: "لە وێدا و لەوێدا ئەمەیان ڕاست دەکات، لەوێدا و لەوێشدا ئەویتریان ڕاستی پێکاوە". ئەو کەمێک نیگەرانیم پێ دەدا، بەڵام لە جۆرە ڕاستەکەیان نا... گوتت چی؟

من هیچم نەگوتبوو. لە فیکرەوە چووبووم و دەشێ لێوم لەگەڵ تێفکرینمدا جووڵابێت، دەشێ ورتەورتێکم بۆ خۆم کردبێ بەبێ ئەوەی بزانم چیم گوتووە... ئەوم لەبەر چاوانمدا بینی، ئەو کە هەمیشە بیری لێ دەکەمەوە. ئەوم بینیوە کە لەکاتی خۆرئاوابووناندا بە جادەیەکی چۆڵدا دێت و دەچێ و چاوەڕێی کەسێک دەکات کە نایەت. منیش لەبەر خۆمەوە گوتوومە: "ئازیز، ئەمە ئیدی کێشەی خۆتە. تۆ ئیدی دەبێت خۆت ڕێگەکە تەی بکەیت. من لێرەدا ناتوانم یارمەتیت بدەم، گەر بیشمتوانیبا یارمەتیم نەدەدایت. لێرەدا تۆ دەبێ بەهێز بیت". لە تێفکریندا بەردەوام بووم: "زۆر باشە کە ئێستا تۆ ئازاد و سووکەڵەیت. ئاخر ئیدی هاسانتر دەتوانیت دەرەقەت بێیت".

مارکێل بە نیگەرانییەوە گوتی: "نا گلاس، ئیدی وا نابێ. چەندێک پێت وایە کە ئێمە دەبێ لێرەدا بەبێ قەترە ویسکییەک دانیشین؟"

زەنگێکم بۆ گارسونەکە لێ دا و ویسکی و لەبەرئەوەی خەریک بوو ساردی دەکرد، دوو بەتانیم داوا کرد. ڕێکێ و هاونشینەکانی هەستان و بەلای مێزەکەماندا تێ پەڕین، بەبێ ئەوەی بمانبینن. ئەو لە ڕاستیدا هیچی

---

(*) Herbert Spencer - (١٨٢٠– ١٩٣٠) فەیلەسوفێکی بەریتانییە. پێی وابوو کە ئەرکی فەلسەفە فۆرمۆڵەکردنی یاسایەکی باڵایە، کە بتوانێ بۆ هەموو گەردوون بشێت. و. کوردی

نەدەبینی، ڕێک و ڕاست وەک پیـاوێک دەڕۆیشت کـە چاوی لە ئامـانجـێک بڕیبێ. کورسییـەک کەمێک لەسەر ڕێگاکـەدا بوو، نەیبینـی و خۆی لێ دا و خـسـتی. دەوروبەرمـان چۆڵ. بایەکی پاییزی بەنێـو درەخـتـەکـاندا دەیوژاند. خۆرنشین خۆڵەمێشیتر و چڕتر دەبوو. بەتانییەکانمان وەک عەبای سوور لە خۆمانەوە پێچاو تا ماوەیەکی زۆر لەبارەی هەموو شتێکەوە دووایـن، مارکێل شـتگەلێکی گـوت کـە زۆر لەوە ڕاستـەقینەتربوون بتـوانرێت بـە وشـە لەسـەر کاخەز بنووسرێن، وشەگەلێک کە من بیرم چوونەتەوە.

**٢٧ی ئۆگۆستی**

ڕۆژێکی تر تێ پەڕی، هەمـدیس شـەو هـات و منیش لەبەر پەنجـەرەکـەمـدا دانیشتووم.

تۆ ئەی تەنیا، ئەی ئازیز!

ئاخـۆ بە مـەسـەلەکـەت زانیـوە؟ ئازار دەچێژیت؟ شـەوانە بە چاوانێکی وەئاگاوە دەنۆڕیت؟ لە نوێنەکەتدا بە پەژارەوە تل دەدەیت؟

دەگریت؟ یان چی دی فرمێسکت وشکی کردووە؟

بەڵام دەشێ ئەو، دواجـار مـەسـخـەرەی پێ بکات. ئەو پڕ ڕەچاوە. ڕەچاوی ئەوە دەکات کە ئەم لە پرسەی شووەکەیدایە. وی هێشتا لێ نەگەڕاوە کە ئەم هەست بە هیچ بکات. ئەم بە ئاسوودەیی دەنوێ و هیچ لە بارەی مەسەلەکەوە نازانێ. ئازیز، کاتێ بە مەسـەلەکە دەزانیت دەبێ بەهێز بیت. تۆ دەبێت ئەوە تێ پەڕێنیت. تۆ دەبێ بزانیت کە ژیان شتی زۆر پێیە بۆت.

تۆ دەبێ بەهێز بیت.

## ٤ی سێپتێمبەر

ڕۆژەکان دێن و دەڕۆن، هەر یەکێکیشیان لەوی تریان دەچێت.

هەمان بەدڕەوشتی، هەست دەکەم هێشتا هەر نەشونما دەکات. ئەمڕۆ هەر لەبەر ئاڵوگۆڕ کابرایەک دەیویست یارمەتیی دەسگیرانەکەی بدەم و لە گرفتاری دەری بهێنم. وی لەبارەی یادەوەرییە دێرینەکان و "سنیوفێ"ی بەڕێوەبەری قوتابخانەوە لە لادیوگۆردەنسلاند دەدوا.

من پێچەقێنیم کرد. سوێندە پزیشکییەکەم بۆ خوێندەوە. ئەوە تا ئەو ڕادەیە کاری تێ کرد، کە دوو سەد کرۆنی نەخت و قەباڵەیەک بە هەمان بڕە پارە لەگەڵ هاوڕێیەتییەکی قایم بە درێژاییی تەمەنی بۆ پێشنیار کردم. ئەوە تا ڕادەیەک شتێکی بزوێنەر بوو لەبەرئەوەی پێ دەچوو کەسێکی هەژار بێت.

کردمە دەرەوە.

## ٧ی سێپتێمبەر

لە تاریکییەوە بۆ تاریکی.

ئەی ژیان من تێت ناگەم. هەندێ جار هەست بە سەرەسوڕەیەکی ڕۆحی دەکەم کە دەچپێنێ و هۆشداری دەدا و ورتە ورت دەکات کە من وێڵ بووم. تازەکی ئەو هەستە دای گرتم. پرۆتۆکۆلی دادگاییەکەم دەرهێنا: هەمان پەڕە کاخەزی یاداشتەکانی ڕۆژانە، کە تیایاندا لێپێچینەوە لەگەڵ هەردوو دەنگەکانی ناخمدا دەکەم: دەنگێک کە دەیەوێ و دەنگێکیش کە نایەوێ. ئەو پەڕە کاخەزانەم دووبارە و دووبارە خوێندوونەتەوە، نەمتوانیوە جگە لەو دەنگەی، کە دەبوو دواجار گوێ ڕایەڵی بم، چ شتێکی تری تێدا بدۆزمەوە، ئەو دەنگەی کە خوان زرنگانەوە ڕاستەکە و دەنگەکەی تریشیان پووچەکەیە..

دەشێ ئەو دەنگەی دواییـیـان ئاقـڵـتـرەکـەیان بێت، بەڵام گـەر گـوێ ڕایەڵی بوومایە، ئەوا دوایین ڕێزم بەرامبەر خۆم لەدەست دەدا.

کەچی... کەچی...

کـەوتوومـەتە ئەوەی خـەون بـە قـەشـەوە ببـینم. هەڵبـەت ئەوە شـتـێک بوو پێشبینی دەکرا و هەر ڕێک لەبەر ئەوەشە کە نەبووەتە مایەی سەرسوڕمانم. بیرم کردبووەوە کە دەتوانم بەهۆی پێشبینیکردنییەوە لە خۆمی ڕزگار بکەم.

**

من دەزانم هێرۆدێس(*) پاشا ئەو تەرزە پێغەمبەرانەی خۆش نەدەویست کە دەسـووڕانەوە و مـردووانیـان زیندوو دەکـردنەوە. دەنا وەکی تر سـتـایشی دەکردن، بەڵام حەزی بەم بەشەی ئیشەکەیان نەبوو...

**

ئەی ژیـان، من تێت نـاگـەم. بـەڵام ناڵێم ئـەوە هەڵەی تۆیە. من ئەوە زیاتر بە جێی باوەڕ دەزانم، کـە من کوڕێکی چەقـاوەسـوو بووم لەوەی کە تـۆ دایکێکی ناپەسەند بووبیت.

دواجـار ئەو خایلـەیە لەلام سەر هەڵدەدا کە دەشێ بێ مـانا بێت بنیـادەم لە ژیان تێ بگات. هەمـوو ئەم شـێتگیـرییـە بۆ ڕاڤەکردن و تێگەیشتن، هەمـوو ئەم لە دووی حەقیقەت بوونە، دەشێ شوێنپێیەکی ساختە بێ. ئێمە ستایشی خۆر دەکەین ڕێک لەبەرئەوەی لە مـەودایەکەوە لێیـەوە لەگەڵیدا دەژیـن کە بۆمـان بە کەڵکە. چەند ملیۆنێک میل نزیکتر یان دوورتر لێیەوە، دەسووتێین یاخۆ دەبینە شەختە. ئاخۆ ئەمە لەگەڵ خۆردا، هەمان شت نییە لەگەڵ حەقیقەتدا؟

---

(*) konung Herodes ٧٣–٤ پ. ز، پادشـای فـەلەسـتین. ئارەزوویەکی گـەورەی بۆ کولتووری گرێکی هەبوو، یەکێک لە کارەکانی سەرلەنوێ ڕۆنانەوەی پەرستگەی ئۆرشەلیم بوو. لە دوایین ساڵەکانی فەرمانڕەواییی ئەم پادشایەدا، تراژیدیایەکی خـوێناویی لە خـێزانـەکەیدا ڕووی دا و ژنەکـەی و سێ کـوڕی خـۆی کـوشـتن. و. کوردی

ئەفسانەیەکی دێرینی فنلاندی دەڵێ: ئەوەی ڕوخساری خوا ببینێت، دەبێ بمرێت.

ئەدی ئۆدیپیۆس. ئەو مەتەڵی دەعباکەی هەڵهێنا و ئیدی لەنێو خەڵکدا بووە بەدبەختترین کەس.

مەتەڵەکان هەڵمەهێنە! پرسیار مەکە! بیر مەکەوە! بیرکردنەوە ترشەڵۆکێکە کە دەمانخوا. لە سەرەتادا وا بیر دەکەیتەوە کە تەنیا دەبێ گەنیو و نەخۆش و ئەوەی کە دەبێ نەمینێت، بخوات. بەڵام بیرکردنەوە وا بیر ناکاتەوە، کوێرانە دەخوات. بەو نێچیرە دەست پێ دەکات کە تۆ شادمانانە دەیخەیتە بەردەمی، بەڵام نابێ باوەڕ بکەیت کە ئەوە تێری دەکات. تەواو نابێت تا دوایین شتێک نەکرۆژێ، کە خۆشەویستە لەلات.

دەشێ نەدەبووایە زۆر بیرم بکردبایەوە، بگرە دەبوو درێژەم بە خوێندنەکەم دابا. "زانست بە کەڵکە، چونکە ڕێگە لە خەڵکی دەگرێ کە بیربکەنەوە"، زانایەک ئەو قسەیەی کردووە. هەروەها دەشێ دەبووایە ئەوە بژیامایە کە ناوی ژیانە، یاخۆ ئەوەی پێشی دەگوترێت "بە ژیانەوە نووسان". دەبوو سوار دارخلیسک بام و شەقم لە تۆپ هەڵدابا و شادمان و ئاسوودە لەگەڵ ژنان و هاوڕێیاندا ژیابام. دەبوو ژنم هێنابا و منداڵم خستبایەوە: دەبوو ئەرکەکانم بەجێ هێنابا. ئەو شتانە پشت و پاڵپشتن. دەشێ گێلێتیش بووبێ کە خۆمم نەهاویشتە ناو سیاسەتەوە و لە کۆبوونەوەکانی هەڵبژاردندا دەرنەکەوتم. ئاخر نیشتمانیش داوای لەسەرمان هەیە. دەی، ڕەنگە فریای ئەمەیان بکەوم...

یەکەم پەیام: تۆ نابێت بێ ئەندازە تێ بگەیت.

بەڵام ئەوەی لەم پەیامە تێ دەگات، ئیدی کەسێکە تازە ئیدی بێ ئەندازە تێ گەیشتووە.

من سەرم گێژ دەخوات، دونیا لەبەرچاوانمدا دەخولێتەوە.

لە تاریکییەوە بۆ تاریکی.

## ٩ی سێپتێمبەر

قەت نایبینم.

زۆر جاران تاوێک دەچمە دەرەوە و سەرێک لە شێپەولێن دەدەم، تەنیا لەبەرئەوەی کە دوایین جار لەوێ قسانم لەگەڵدا کرد. ئەم ئێوارەیە لەسەر بەرزاییەکەی لای کلێساکەوە ڕاوەستام و تەماشای خۆرم کرد، کە ئاوا دەبوو. لەوکاتەدا زانیم ستۆکهۆڵم چەندێک جوانە. من پێشتر زۆر بیرم لەوە نەکردبووەوە. هەمیشە لە ڕۆژنامەکاندا دەیخوێنینەوە ستۆکهۆڵم جوانە، ئاخر لەبەرئەوەیە کە بنیادەم زۆر گوێ بەوە نادا.

## ٢٠ی سێپتێمبەر

لە داوەتی شێودا لەگەڵ خاتوو P. ئەمڕۆ لەبارەی ڕێوڕەسمی نیشانەکردنە چاوەڕوانکراوەکەی "ڕێکێ"وە، وەک شتێکی گرنگ قسان کرا.

....هاودەمیی لەگەڵ مندا تا دێت مەحاڵتر دەبێت. کاتێ کەسێک قسەم بۆ دەکات، بیرم دەچێتەوە وەڵامی بدەمەوە. زۆر جاران گوێم لێی نییە. بەخۆم دەڵێم بڵێی هەستی گوێگرتنم لاواز نەبووبێت؟

ئینجا ئەم دەمامکانەش! هەر هەموو بە دەمامکەوە دەڕۆن. ئەم خزمەتە مەزنەیان بە خۆڕاییە. ناخوازم بەبێ دەمامک بیانبینم. بەڵێ، ناشمەوێ بەبێ دەمامک خۆم دەرخەم! بۆ ئەوان نا!

ئەدی بۆ کێ؟

چەندێک توانیم زووتر لەوێ ڕۆیشتم. دەڕۆیشتم و بەدەم ڕێگەوە سەرمام بوو، لە ناکاوێکڕا شەوە ساردەکان هاتن. لەو باوەڕەدام زستانێکی سارد بەڕێوەیە.

دەڕۆیشتم و بیرم لەو دەکردەوە. یەکەم جارم لەیادە کە هات بۆ لام و داوای یارمەتیی لێ کردم. چەند زوو خۆی بەرهەڵدا کرد و نهێنییەکەی خستە ڕوو،

بەبێ ئەوەی چ پێویست بەوە بکات. ئەو جارە چ گەرم گۆناکانی دەسووتان! بیرمە گوتم: مرۆڤ دەبێ شتی لەو جۆرە بە نهێنی بیهێڵێتەوە. ئەویش گوتی: "حەزم دەکرد بیڵێم. حەزم دەکرد بزانن من کێم". چییە گەر ئێستا لەم تەنگانەیەمدا بچم بۆ لای، هەروەک ئەوەی کە ئەو هات بۆ لای من؟ بچم بۆ لای و پێی بڵێم: "بە تەنیا ناتوانم بزانم من کێم، ناتوانم هەمیشە و بۆ هەمووان دەمامک بپۆشم! دەبێ کەسێک هەبێ تا خۆمی بۆ ڕووت بکەمەوە، دەبێ کەسێک هەبێ بزانێت من کێم...".

ئاخ، ئەوسا هەردووکمان شێت دەبین.

هەر وا لە خۆوە بە جادەکاندا دەڕۆیشتم. گەیشتمە لای ئەو خانووەی کە ئەوی لێ دەژیا. یەکێک لە پەنجەرەکانی ڕووناک بوو. پەردە دەرابەییەکەی دانەدرابووەوە، پێویستی پێی نییە، ئاخر لەوبەری جادەکەوە ئەرزی بەرفراوان کە نەکرابوونە خانوو، تەختە و شتی لەو جۆرەی لێ دانرابوو، کەس ناو خانووەکەی نەدەبینی. منیش هیچم نەبینی، هیچ قەلافەتێکی تاریک، هیچ باسک و دەستێک کە بجووڵێت، تەنیا تیشکی زەردی چراکە لەسەر پەردە تەنکەکە. لە فیکرەوە چووم: "ئێستا بڵێی چ بکات، خەریکی چ بێت؟ کتێبێک دەخوێنێتەوە یاخۆ دانیشتووە و سەری لەنێو دەستیدایە و بیر دەکاتەوە، یان پرچی بۆ شەو شانە دەکا... ئاه، گەر لەوێ بام، گەر بمتوانیبا لەوێ لەلای بام... لەوێ ڕاکشابام و کاتێ کە لەبەر ئاوێنەدا پرچی دادەهێنێ و لەسەرخۆ جلەکانی دادەکەنێ، تەماشایم کردبا و چاوەڕێ بام... بەڵام وەک سەرەتایەک نا، بۆ یەک جار نا، بگرە وەک ڕیزێک لە عادەتێکی درێژ و باش. هەموو شتێک سەرەتایەکی هەیە، هەروەها کۆتاییەکیش. ئەوەی من نە سەرەتای هەبا و نە کۆتایی.

نازانم چەندێک لەوێدا بێ جووڵە وەک پەیکەر ڕاوەستام. هەورێکی بڵێسەیی بە تریفەی مانگ، بێ تین دەدرەوشایەوە و وەک دیمەنێکی دوور بە شێنەیی بەژوور سەرمەوە دەجووڵا. سەرمام بوو. جادەکە چۆڵ. ژنێکی شەوگەڕم بینی لە تاریکییەکە هاتە دەرێ و نزیکم بووەوە. بەلامدا تێ پەڕی و ڕاوەستا. لای

کـردەوە و بە چاوانێکی برسـییـەوە تەمـاشـای کـردم. من سـەرم لەقـاند: ئەو ڕۆیشت و لە تاریکاییەکەدا بزر بوو.

لەناکاوێکڕا گوێم لە زڕەی کلیلێک بوو لە کێلونی دەرگای دەرەوەدا، کرایەوە و قـڵافـەتێکی تاریک دزەی کردە دەرەوە... ئاخـۆ هـەر بەڕاستی خـۆی بوو...؟ ئاخـۆ ئەوە خـۆیەتی کە لە نـیوەشـەودا دەچێـتـە دەرەوە بەبێ ئەوەی چراکـەشی بکوژێنێـتـەوە...؟ ئەوە چییە؟ هـەسـتـم کـرد دڵـم لە لێدان دەکەوێ. حەزم دەکـرد بزانم بۆ کوێ دەچێ. هێور هێور دوای کەوتم.

تەنیا بەرەو لای سندووقی پۆستی لای سـووچەکە چوو ، نامەیەکی تێ فڕێدا و بە پەلە گەڕایەوە. ڕوخساریم لەبەر تیشکی گڵۆپێکدا بینی: وەک قـومـاشی چادر ڕەنگی پەڕی بوو.

نازانم ئاخۆ ئەو منی بینی.

**

هـەرگـیـز نەبووە هـی مـن، هـەرگـیـز. هـەرگـیز گـۆنـایم سـوور هـەڵنەگـەڕاند، هـەرگـیـز هـۆکـاری ئـەو ڕەنگپـەڕیوییـە تەباشـیـرئاسـایەش کـە هـەنووکـە بە ڕوخسـارییـەوەیەتی، من نەبووم. ئەو هـەرگـیز بە پەژارەیەکەوە لە دڵدا شـەوانە بە نامەیەکەوە بۆ من بە پەلە بە جادەکەدا ناڕوات.

ژیان بەلامدا تێ پەڕی.

## ٧ی ئۆکتۆبەر

پایز درەختەکانی وێران کردم. دارکەستانەکەی ئەودیو پەنجەرەکەم هەر لە ئێستاوە ڕووت و ڕەش هەڵگەڕاوە. هەور بە گەواڵەی قورس بەسەر سەربانەکەدا تێ دەپەڕێ و من ئیدی هەرگیز خۆر نابینم.

پەردەی تازەم بۆ پەنجەرەی ژووری کارکردنەکەم تەگبیر کردووە: پەردەی تەواوێک سپی. کە ئەم بەیانییە لە خەو هەستام، یەکەم جار وامزانی بەفر باریوە: هەمان ڕووناکی لە ژوورەکەدا بوو، وەک کاتێک کە یەکەمین بەفر دادەکا. هەستم کرد بۆنی بەفری تازەکی باریو دەکەم.

بە زوویی بەفر تێی دەکات. مرۆڤ لە هەوادا هەست بە بۆنی دەکا.

دەی با بەخێر بێت. لێ گەڕێ با بێت. لێ گەڕێ با تێی کات.

**

سوپاس بۆ هاوڕێی چیرۆکنووس عەتا محەمەد کە دوو جار ئەم تێکستەی خوێندەوە و بە سەرنج و تێبینییەکانی سوودمەندی کرد.

